زنجیرەی
خێـزانـی
سەردەم

HOMOSEXUALITY
THE CRIME OF THE CENTURY

01



# هاوڕەگەزبازی

## تاوانی سەردەم



ئامادەکردنی:
**نـاوەندی ڕەواسخ**

وەرگێڕانی:
**موزەفەر قەسرێیی**



# هاوڕەگەزبازی تاوانی سەردەم

**ئامادەکردنی: ناوەندی ڕەواسخ**
**وەرگێڕانی: موزەفەر قەسرێیی**


چاپی یەکەم ١٤٤٥ك - ٢٠٢٤ز



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
\ tafseeroffice

RAWASEKH
رواسخ
اصدارات • دراسات • برامج

ئامادەکردنی پێڕست - نووسینگەی تەفسیر
قەسرێیی، موزەفەر
هاوڕەگەزبازی تاوانی سەردەم، ناوەندی ڕەواسخ (ئامادەکار)، موزەفەر قەسرێیی (وەرگێڕ)
١٨٤ لاپەڕە،
١٤* ٢١ سم
بابەت، فیکری، پەروەردەیی
ISBN: 978-9922-690-51-3

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/
هەرێمی کوردستان، ژمارە سپاردنی (٩٩٣)ی ساڵی (٢٠٢٣) پێدراوە.

"بیروبۆچوونی ئەم کتێبە، مەرج نییە هەمان بیروبۆچوونی نووسینگەی تەفسیر بێت"

دیزایین، نووسینگەی تەفسیر

# ناساندنی زنجیرەکە

ڕۆژانە گەنجی موسڵمان بەگشتی و کۆمەڵگەی کوردەواری بەتایبەت، ڕووبەڕووی بیرۆکەی نوێی ناباو و دروستکراو، پتر ئاراستەکراو دەبنەوە. مەبەست لەم بیرۆکە ئاراستەکراوانەیش، بریتییە لە تێکدان و سەرگەردانکردنی مرۆڤ بەگشتی و چەند کۆمەڵگەیەک بەتایبەتی، بۆ مەرامی بڵاوکردنەوەی بیرۆکەگەلێکی بێشوومار.

لەم سۆنگەیەوە، (نووسینگەی تەفسیر) وەک کاری هەمیشەیی خۆی، بە ئەرکی سەر شانی خۆی زانیوە بە ڕووی هەر بیرۆکەیەکی ناباودا هەڵبشاخێت، کە ئاراستەی کۆمەڵگەکەمان دەکرێت. هەر بۆیە لەم ڕووەوە، هەڵساین بە وەرگێڕان و نووسینی زنجیرەیەک کتێبی سادە و ڕەوان، بە جۆرێکی ئەوتۆ، کە خوێنەرانی قۆناغی پێشکەوتووی بنەڕەتی و ئامادەیی بتوانن بەئاسانی هەرسیان بکەن؛ تەنانەت زنجیرە کتێبەکە بە جۆرێکی وا دیزایین کراون، کە خوێندکارانی زانکۆ و مامۆستا و پسپۆڕانیش سوودی گەورەیان لێ ببینن و ببن بە هەوێنی سەرچاوە گرنگەکانیان.

## ڕێخۆشکردن:
## تەقینەوە گەورەکەی سێکس لە سەدەی بیستەمدا:

(هیچ مرۆڤێکی خۆرئاوایی لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا نییە، کە ڕزگاری بووبێت لە دڵەڕاوکێ بەرانبەر بە نەفامی واتایی و هێرشکرانە سەر ژیانی تایبەتی و بەزاندنی سنووری کەسایەتیی، ئەمەیش بەهۆی ڕیکلام و تێکچوونی کۆمەڵگە و گۆڕانی خۆشەویستی بۆ چێژوەرگرتن).

(ئالان تۆرین لە کتێبی ڕەخنەگرتن لە نوێگەری)

چۆن بتوانین وەسفی ئەو شەپۆلە سێکسییە بەهێزە بکەین کە ئەم سەردەمەی پێ جیا دەکرێتەوە، بۆ هەر لایەک دەڕۆیت لە بەرانبەرتە؟ وای لێ هاتووە بەڕەڵایی بووەتە جێگرەوەی ڕێکخراوی، لادان بووەتە جێگرەوەی ڕاستەڕێیی، ڕووتی بووەتە جێگرەوەی پۆشتەیی، داوێنپیسی بووەتە جێگرەوەی پاکیزەیی؛ دەرخستن بووەتە جێگرەوەی داپۆشین و خراپە بووەتە جێگرەوەی چاکە...

مرۆڤ وای لێ هاتووە تەنیا لە ئێستادا بژی، بەبێ ئاوڕدانەوە لە

ڕابردوو و داهاتوو! وای لێ هاتووە ئارەزووی ژیانی ڕێکخراو و سنووردار بە بەهاو ڕەوشتەکان نەکات!

دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان وەلانراون و حەز و ئارەزووەکان بێ کۆت و بەند لە شوێنی نەشیاودا بەگەڕ خراون.

جوانی بووەتە ناشرینی و ناشرینی بووەتە جوانی، دووفاقی بووەتە زیرەکی کۆمەڵایەتی، هاوڕەگەزبازی بووەتە سروشتی مرۆڤایەتی و خراپە و بەدڕەوشتی بوونەتە نیشانەی مێینەیی و نێرینەیی!

## شۆڕشی سێکسی: (مێژوویەکی کورت)

دوای دووەم جەنگی جیهانی بەتایبەت لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا، چەند گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لە کۆمەڵگە خۆرئاواییەکاندا ڕوویاندا، لەوانە شۆڕشی ڕۆشنبیری و بزاوتی قوتابییان و کرێکاران؛ هەروەها شەپۆلێکی نوێی فەردانییەت و لیبراڵییەتی توندڕەو، کە دابونەریت و بەها کۆمەڵایەتی و ڕەوشتییە باوەکانی ڕەت دەکردەوە، سەری هەڵدا؛ هەروەتر لەو کۆمەڵگەیانەدا لادانی ڕەوشتی و ئایینی و کۆمەڵایەتی پەیدابوون.[1]

لەو کاتەوە، تا ئێستا جگە لە ئینتەرنێت، هیچ دیاردەیەک نەبووە ئەوەندەی شۆڕشی سێکسی کاریگەریی هەبێت لەسەر دووبارە داڕشتنەوەی مرۆڤایەتی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و دووبارە نووسینەوەی ژیانی مرۆڤ.

ئەو سەردەمە بەسەرچووە، تا کاتی هاوسەرگیری، گەرەنتی پاکیزەیی کچ بکرێت. ئەو سەردەمە تێپەڕی، کە ئەو ژنانەی لە ڕێی پەیوەندییەکی کاتیی سێکسییەوە سکپڕ بوون، ناچار بە هاوسەرگیری، یان لەباربردن بکرێن؛ یان منداڵە ناشەرعییەکەیان

[1] من أجل صهيون: التراث اليهودي المسيحي في الثقافة الأمريكية، فؤاد شعبان، دار الفكر، ط١، ص: ٢٣٧

ببەنە خانەی بێسەرپەرشتان. لە ئێستادا وەکو جاران هەست بە شەرمەزاری ناکەن، ئەوان لە ئێستادا ئازادیی سێکسییان هەیە و بەگوێرەی ئەو ئازادییە ڕەفتار دەکەن.

ئێستا وەکو جاران ئەو منداڵانەی لە دەرەوەی چوارچێوەی خێزاندا لەدایک بوون، سەرچاوەی ترس و دڵەڕاوکێی کۆمەڵایەتی نین، بەڵکو لەم ڕۆژگارەدا لە هەندێ وڵاتدا زۆرینەن، بۆ نموونە: لە وڵاتێکی وەک سویددا.

لە لایەکی ترەوە، شۆڕشی سێکسی بووەتە هۆی ئەوەی چیتر وەک تاوان، یان نەخۆشی سەیری هاوڕەگەزبازی نەکرێت، دەرگای لە بەردەم بزاوتی مێیینەی و فێمینیزم و ئایدۆلۆجیای جێندەر[١] و گۆڕینی ڕەگەزدا واڵا کردووە؛ وەک چۆن خووی نهێنیی لە کردارێکی قەدەغەکراو و گرفتێکی پزیشکییەوە گۆڕی بۆ کردارێکی سروشتی، کە وەک ڕاهێنانێک بۆ فێربوونی سێکس برەوی پێ بدرێت.[٢]

---

[١] کۆمەڵناسان چەمکی (ڕەگەز _ sex) بۆ گوزارشتکردن لە جیاوازییە شیکاری و فیسیۆلۆجییەکانی نێوان نێر و مێ بەکاردەهێنن. هەرچی چەمکی جێندەر(جۆر)ــە بە واتای بیرۆکە و دید و بۆچوونە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکان بۆ واتای نێرینەیی و مێیینەیی بەکاردەهێنن. مەبەست لە جێندەر بریتییە لە ڕەتکردنەوەی جیاوازیی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیی نێوان دوو ڕەگەزەکە.

[2] Gert Hekma, Alain Giami, Sexual Revolutions, palgrave Macmillan London, first Edition, 2014, p: 9-16

## شۆڕشی گێرەشێوێنی:

لەم دوو سەدەیەی کۆتاییدا، مرۆڤایەتی چەندین شۆڕشی بە خۆیەوە بینیوە، بەڵام لە هەموویان کاریگەرتر و درێژخایەنتر شۆڕشی سێکسی بووە، کە لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو لە خۆرئاوادا سەری هەڵدا. بۆ ماوەیەکی کورت سێکس وەک جێگرەوەی ئایین دەرکەوت، پەیامبەرانی مژدەی ئازادیی سێکسییان دەدا و بانگەوازیان بۆ داماڵینی مرۆڤ لە هەموو کۆت و بەندێک دەکرد.[١]

چەمکی شۆڕشی سێکسی بۆ یەکەمین جار لە لایەن شیکەرەوەی دەروونی (ئۆتۆ گرۆس Otto Gross) بەر لە یەکەم جەنگی جیهانی بەکارهێنرا.

دوای ئەوە (ڤیلهێلم ڕایش wilhelm Reich) خاوەنی کتێبی (شۆڕشی سێکسی) بوو بە توێژەری سەرەکیی پرسەکە. ڕایش توانیی بیردۆزەکانی مارکس و فرۆید پێکەوە کۆبکاتەوە و بگاتە ئەو دەرئەنجامەی، کە ئازادیی سێکسی پێویستە لەگەڵ ئازادیی کۆمەڵایەتیدا یەک بگرێتەوە، یان لانیکەم بەشێک بێت لێی.[٢]

---

[١] خواء الذات والأدمغة المستعمرة، مراد هوفمان، ترجمة عادل المعلم، نشأت جعفر، مكتبة الشروق الدولية، ط٢، ص: ٧٤

[2] Gert Hekma, Alain Giami, Sexual Revolutions, palgrave Macmillan London, first Edition, 2014, p: 6

لە ناوەڕاستی شەستەکاندا، ئازادیی سێکسی ڕێگەی تایبەتی خۆی گرتەبەر، چونکە چەند ڕووداو و گۆڕانکارییەک ڕوویاندا کە تێڕوانین و بیرۆکە و چالاکیی نوێیان لە بارەی سێکس و هاوسەرگیری و خێزان و ژیانەوە خستەڕوو و چەندین وێنە و ڤیدیۆی سێکسییان لەناو خەڵکدا بڵاوکردەوە. هاوکات لەگەڵ ئەو ڕووداوانەدا وردە وردە گرنگی بە گفتوگۆکردن دەربارەی لەباربردن لە وڵاتی سوید دەکرا، هەروەها لە وڵاتی هۆڵەندا لە ساڵی ١٩٦٥ بزووتنەوەی (پرۆڤۆس Provos) بانگەوازی بۆ تێکەڵیی سێکسی دەکرد و خەڵکی بۆ ئەوە هان دەدا. دوای ئەوە بە دوو ساڵ، سەدان کەس لە ئەندامانی کۆمەڵەی هیپز[١] لە باخچەی دەروازەی زێڕین لە شاری سانفرانسیسکۆ، کە دواتر بەناوی هاوینی خۆشەویستییەوە ناسرا[٢] کۆبوونەوە، هەرچی کۆتایی ئەو

[١] هیپز: بزاوتێکی کۆمەڵایەتیی دژ بە ڕۆشنبیرییە، دابونەریتی ژیانی باوی ئەمریکیی ڕەتکردەوە و لێی یاخی بوو. ئەم بزاوتە لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا دامەزراوە و لە زانکۆکانی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دەستبەکاربووە، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی کورت بزاوتەکە لە بەریتانیا و کەنەدا و چەندین وڵات و کۆمەڵگەی تردا بڵاوبووەوە و بوو بە بزاوتێکی جیهانی.

بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر، قژی درێژ و جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ، ڕەتکردنەوەی بەها کۆمەڵایەتییەکان و بەرەڵایی سێکسی لە نیشانەکانی شوێنکەوتوانیان. بۆ بەرچاوڕوونی زیاتر سەردانی ئەم لینکە بکە: https://shorturl.at/ajKTG

[٢] لە مانگی کانوونی دووەمی ١٩٦٧ نزیکەی بیست هەزار کەس لە باخی دەروازەی زێڕین لە سان فرانسیسکۆ کۆبوونەوە، لە دژی بڕیاری ویلایەتەکە بە قەدەغەکردنی ماددەی هۆشبەری LSD، دواتر ژمارەیان گەیشتە سەد هەزار کەس لە ناوخۆی

←

ڕووداوانە بوو بریتی بـوو لە ڕاپەڕینـی (سـتۆن وۆڵ Stonewall) لە سـاڵی ١٩٦٩؛ کاتێــک پــۆلیس هەڵیکوتــایە ســەر بــاڕێکی هاوڕەگەزبازان لە نیویۆرک بۆ ئەوەی دەستگیریان بکەن، کە دواتر سەری کێشا بۆ گـرژی و ئـاڵۆزی لە نێـوان پـۆلیس و کـۆمەڵگەی هاوڕەگەزبازیـــــدا. ئەم ڕووداوە پریشـــــکی بـــــزووتنەوەی هاوڕەگەزبازان بوو.[1]

هەر لەو ماوەیەدا حەپی ڕێگرتن لە دووگیانی پەیدابوو و لەنێو کچانـــدا بـــڵاو بـــووەوە. هەروەهـــا لە فەڕەنســـا و ویـــلایەتە یەکگرتووەکان و چەندین وڵاتی تری جیهاندا شۆڕشـی فێرخـوازان دەستی پێ کرد.

ئەوسـا فرۆشـگاکانی سـێکس دەسـتیان کـرد بە بڵاوبـوونەوە، بووکەڵە و کەلوپەلی سـێکس و گۆڤـارە سێکسـییەکان بەئاشـکرا دەفرۆشران؛ هەروەها یانەکانی کاری سێکسـی بەئاشـکرا دەسـتیان کـرد بە کـارکردن، لە کاتێکـدا پێشـتر بەنهێنـی کاریـان دەکـرد، سەماکاران بەبێ ترس و شەرم خۆیان نماییش دەکرد و خراپەکـاری

---

ئەمریکا و دەرەوەدا، بـۆ داواکردنـی ڕەخسـاندنی دۆخێکـی ئـازادانە لە بەکارهێنـانی ماددەی هۆشبەر و ئازادی لە پەیوەندییە سێکسییەکاندا.
بۆ زانیاری زیاتر:

https://bit.ly/3PrVJSM
https://shorturlat/afgoq
(1) Sexual Revolutions, p: 1

خـرایە نێـو کـۆمەڵگەوە و پەیوەنـدییە سێکسـییەکان لە دەرەوەی خێزان بڵاوبوونەوە.

کچـان دەسـتیان کـرد بە پۆشـینی تەنـوورە و جـلی کـورت و دەرخسـتنی جەسـتەیان، شـانۆ و سـینەماکان پڕبـوون لە گـرتەی ورووژێـنەر - لە کاتێکـدا پێشـتر دەسـەڵاتداران ڕێگرییـان لەوە دەکرد -، مادده سێکسییەکان لە قەدەغەبوونەوە گۆڕان بـۆ پیشـە و بەهرە و سەرچاوەی بەدەستهێنانی ملیۆنان دۆلار.

خووی نهێنـی، سێکسـکردن بەر لە هاوسـەرگیری، گـۆڕینەوەی هاوسەر، سێکسی بەکـۆمەڵ؛ هاوڕەگەزبـازی، خـۆڕووتکردنەوە و بازرگانی سێکسی، هەموویان بوون بە بەشێکی ئاسایی بێـپەردە لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا باس دەکران و ڕاگەیاندنیش بەبێ سانسـۆر بە گوێی هەموانیدا دەچرپاندن.

دیـمەنی ڕووت لەسـەر بەرگـی گۆڤـار و فـیلم و زنجیـرە و ڕێکلامەکاندا بوو بە شتێکی دووبارە و بەربڵاو، تا وای لێ هاتبوو نزیک بێت لە مەحاڵەوە بتوانرێت شـتێک بەبـێ بـوونی ڕەمزێکـی سێکسی لە ڕیکلامەکەیدا بفرۆشرێت، هەروەک بیرمەندی ئەڵـمانی هۆفمان دەیوت.[1]

ئاسـتی ئەم شۆڕشـە لە شەسـتەکان و حەفتاکـانی سـەدەی

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، خواء الذات والأدمغة المستعمرة، لا٧٤.

ڕابردوودا بەرەو بەرزبوونەوە ڕۆیشت، ساڵی ١٩٧٣ بە یەکێک لە مەشخەڵەکانی ڕێگەکە دادەنرێت، چونکە لەو ساڵەدا دوو بڕیار دەرکران، کە کاریگەریی گەورەیان بەسەر بەهێزکردنی شۆڕشی سێکسییەوە هەبوو؛ یەکەمیان بڕیاری دادگای باڵای ئەمریکی، کە بڕیاریدا لەباربردن بکرێتە کارێکی ئاسایی. دووەمیان بڕیاری کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ پزیشکیی دەروونناسی، کە هاوڕەگەزبازیی لە بەڵگەی بەرجەستەو ئامارییەوە گواستەوە بۆ نەخۆشییە دەروونییەکان[1]؛ دواتر لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا وردەکاریی زیاتر لەسەر ئەم بڕیارە باس دەکەین.

جەستەی ڕووت و دەرخستنی، هۆکاری گەورەی ئەم گۆڕانکارییە بوو، کە وای کرد جەستە وەک کەسایەتی سەیر بکرێت و ڕێزی لێ بگیرێت و لە ژێر تیشکی خۆردا نازی هەڵبگیرێت. ئیتر وای لێ هات نەتوانرێت لە ڕێی ڕێکخستنەوە کەسایەتی بنیات بنرێت، بەڵکو هۆکاری بنیاتنان بوو بە کورتکردنەوەی کەسایەتی لە جەستەدا و بە دیاریکراوی لە ڕێی سێکسەوە.

لەم سەردەمەدا کارکردن بە ئازادی و بێ بەندوبار و هەڵبژاردنی شێوازی ژیان بە شێوەیەکی ئازادانە، لە هەموو ڕووداوە

[1] شفاء الحب، أوسم وصفي، الهيئة المصرية العامة لدار الكتب٢٠٠٧، ل١٤٧.

کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکان گرنگترە. ئەم خاڵە، خاڵی چاودێریی هاوچەرخەکانمانە و لە چاوی ئەواندا مافێکی یاساییە، وەک زانای کۆمەڵناسی فەرەنسیی (جیل لیپۆڤیتسکی Gilles Lipovetsky) لە کتێبەکەیدا (عصر الفراغ - سەردەمی دەستبەتاڵی)دا شیی کردووەتەوە.[١]

---

[١] عصر الفراغ، جيـل ليبوفتسـكي، ترجمـة حـافظ إدو خـراز مركـز نمـاء، ط١، ٢٠٢٨، ص٣٢

## ئالوودەبوونی سێکس:
## ئارەزووی جیاواز و ویستی یاخییانە:

لە گەرمەی ئەم فەوزایەدا، بـازاڕ بـووەتە فـاکتەرێکی بەهێـز، سێکسـیش بـووەتە کـاڵایەکی وا، کە لە بـازاڕدا بانگەشـەی بـۆ دەکرێت و دەچێتە ژێر باری یاساکانی (خواست و خستنەڕوو)ـەوە، تـا گەیشـتۆتە ئەو ئاسـتەی خواسـتە سێکسـییەکان لە سـنووری خۆیان دەرچوون؛ لەبری ئازادکردنی مرۆڤ، کردوویـانە بە کـۆیلە و ئالوودەی بوون، بەجۆرێکی ئەوتۆ، کە کۆمەڵگەی ئەمریکی هێشتا بەتەواوەتی لەگەڵیدا ڕانەهاتووە.

چالاکییە سێکسییەکان لەم ڕۆژگارەدا ڕەهەنـدێکی جیاوازیـان هەیە، کە هەندێک لە تاکەکان هەوڵـی ئەنجامـدانی دەدەن. پێشـتر ژیانی سێکسی بریتـی بـوو لە پەیوەنـدیی نێـوان دوو ڕەگەزەکە و لەچوارچێوەی هاوسـەرگیریدا، بەڵام لەم ڕۆژگـارەدا چەنـدین جـۆر لەم پەیوەندییە هاتوونەتە کایەوە و برەویشیان پێ دەدرێت.[1]

ئەم پێشوازیکردنە لە چێژ (pleasure orientation)، بە بۆچوونی بیرمەندی میسریی (عبدالوهاب المسيري) بووەتە هۆی

---

[1] أنتوني غدنز، علم الاجتماع، ترجمة فايز الصباغ، مركز دراسات الوحدة العربية.

دەرکەوتنی مرۆڤێکی خوولاوە بەدەوری خود و بەرژەوەندی و چێژدا، کە ڕزگاربوونی خۆی تەنیا لە بەکاربردن و چێژدا دەبینێتەوە، بەرگەی هیچ سنوور و کۆت و بەند و بەرپرسیارییەتییەک ناگرێت؛ هەر بۆیە ناتوانێت کار بۆ بەدیهێنانی خواستەکانی بکات، بەڵکو دەیەوێت ڕاستەوخۆ و بەخێرایی هەموو خواستەکانی بێنەدی.[1]

ئەوەی جێی تێڕامانە ئەوەیە، کە مامۆستای کۆمەڵناسی ( Gert Hekma) و توێژەر لە پەیمانگای نیشتمانی بۆ پزیشکی ( Alain Giami) لە پێشەکیی کتێبی (شۆڕشی سێکسی Sexual Revolutions)دا باسی لێوە کردووە، سەبارەت بە کرانەوەی دەزگای ڕاگەیاندنی تایبەت بە سێکس و دانانی ئامرازی نوێی پەیوەندی وەک ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و... هتد، کە وێنە و ڕووداوە سێکسییەکان بۆ ملیۆنان کەس دەگوازنەوە. هەموو ئەمانە بوونەتە جیهانێکی نهێنی بۆ ئەم لایەنانە و خراپەکاری لە بەردەم کۆمەڵگەدا نیشان دەدرێت.

مادده بێڕەوشتییەکان بەر لەوەی ببن بە چالاکیی بازرگانی بۆ پیشەسازیی سێکسی، سەرەتا سرووشتێکی سێکسییان بە کۆمەڵگە خۆرئاواییەکان بەخشیبوو و کاریگەرییان بەسەر

---

[1] الثقافة والمنهج١، حوارات مع عبدالوهاب المسيري، تحرير سوزان حرفي، دار الفكر ط١، ص١٢١

سیاسەت و هونەر و کۆمەڵگە جیاوازییەکانەوە هەبوو، تەنانەت بەسەر ژیانی ڕۆژانەی ئەو کۆمەڵگەیانەیشەوە.[١]

هاوسەرگیری و شێوە کلاسیکییەکەی خێزان کەوتنە ژێر شاڵاوی بزووتنەوەی ئافرەتان و هاوڕەگەزبازییەوە و دەستکرا بە قسەکردن لەسەر دانانی یاسای نوێ بۆ ڕازیبوون بە شێوەی نوێ و نامۆی خێزان و پەیوەندییە سێکسییەکان. فێمینیزم و هاوڕەگەزبازە ڕەگەزگۆڕاوەکان بوون بە باسوخواسی گشتی و هەژمونی بڕیاردانیان گرتە دەست و ڕۆڵی دەوڵەت لە دانانی سیاسەتی گشتی و دانانی چوارچێوەی ڕەوشتی بۆ تاک و کۆمەڵ کەم بووەوە.

لە بەرانبەردا، ڕۆڵی خێزان سنووردار کرا و تەنیا لە بەخێوکردنی منداڵ و بنیاتنانی کۆمەڵگەدا کورت کرایەوە و سنووردار کرا. بەپێچەوانەی پێشکەوتن و گەشەسەندنی ماددی و تەکنیکی، مرۆڤ ڕوو لە دوا و بەرەو پاشەکشێیە و کۆمەڵگەیش خەمی مانەوەی نییە.

هەموو ئەو وێرانکارییە کۆمەڵایەتییانە و نەمانی سنووری ڕەوشت بوونەتە هۆی درووستبوونی بارودۆخی دەروونی و کۆمەڵایەتیی قورس و ناخۆش، وەک: هاوسەرگیریی کاتی و

---

(1) Gert Hekma, Alain Giami, Sexual Revolutions, palgrave Macmillan London, First Edition 2014, p:11

جیابوونەوەی ئاسان و خێزانی یەک لایەنە - واتە یـان بـاوک، یـان دایک بەڕێوەی دەبات -، یان خێـزانی ئـاوێتە، کە ئـافرەتەکە چەنـد منداڵێکی لە چەند پیاوێکی جیاواز هەیە.

ئەوەی ئێستا دەیبینـین پێشـکەوتنێکە دواکەوتنـی لە هەناویـدا لەخۆگرتووە و بووەتە هۆی هەژانی دەروونی بۆ ئافرەت و منداڵ.[١]

---

[١] مرآة الغرب المنكسرة، حسن أوريد.

## هاوڕەگەزبازی، قەیران و ململانێ:

لە ساڵی ١٩٨٩ دانیمارک بوو بە یەکەمین وڵات، کە ڕێگە بە دوو مرۆڤی هاوڕەگەز بدات پەیوەندیی سێکسییان لە نێواندا هەبێت، دەوڵەتیش لە ژێر ناوی هاوبەشی مەدەنی، یان ماڵی هاوبەش دانی پێدا بنێت. دوای چەند ساڵێک لەم بڕیارە، یاسای هاوڕەگەزبازی لە چەندین وڵاتدا خرایە بواری جێبەجێکردنەوە، نەرویج (١٩٩٣) و سوید (١٩٩٥) و ئایسلەندا (١٩٩٦) و هۆڵەندا (١٩٩٨) و چەندین وڵاتی تری ئەورووپی بە شانشینی یەکگرتوویشەوە (٢٠٠٥) و ئێرلەندا (٢٠١١) و... هتد. دوای ماوەیەک، لەگەڵ هەژموونی ئەجێندای هاوڕەگەزبازان بەسەر سیاسەتدا، هەموو ئەو وڵاتانە دانیان بە هاوسەرگیریی هاوڕەگەزبازیدا نا (دوو کەسی هەمان ڕەگەز) و وەک هاوسەرگیرییەکی یاسایی ناسێنرا.

لە ئەمڕۆدا سێ وڵات لە جیهاندا دان بە هاوسەرگیری هاوڕەگەزبازدا دەنێن و یاسایان بۆ دەرکردووە و دوو هاوسەرە هاوڕەگەزەکە مافی دایبابیشیان هەیە و بە یاسا مافی ئەوەیان هەیە منداڵ لەخۆبگرن و بەخێوی بکەن.[١]

---

[1] Same-Sex Marriage Around the World: https://shorturl.at/nelwY

پرسی هاوڕەگەزبازی لەم ساڵانەی دواییدا تەنیا وەک دۆخێکی بەرگری بوو لە کۆمەڵێکی دیاریکراو، کە دەچەوسێنرانەوە و هەوڵیان دەدا دان بە بوون و مافەکانیاندا بنرێت، بەڵام لە ئێستادا بەرەوپێشچوونێکی گەورەیان بەخۆیانەوە بینیوە و هاوشێوەی ئایدۆلۆجیایەکی گشتگیری لێ هاتووە، کە دەیەوێت کۆمەڵگە بەپێی پێوەرەکانی خۆی دابڕێژێتەوە.

زۆر بە خێرایی ئەم پرسە لە دۆخی یەکەمی دەرچوو بۆ دۆخێک، کە پشت بە دەسەڵاتەکەی ببەسترێت بۆ سەپاندنی بۆچوونەکانی لە هەموو بوارەکاندا: لە ڕاگەیاندندا، لە خۆشگوزەرانیدا – نێتفلێکس نموونەیەکی دیارە – لە یاسادا، لە فێرکردن و سیاسەتدا.

تا وای لێ هاتووە ئامرازەکانی ترس و تۆقاندن بەکاربهێنێت دژ بە هەرکەس و لایەنێک، کە لەگەڵیدا هاوڕا نەبێت، ئەمە جگە لەوەی لە هەموو لایەکەوە پاسەوانی دەکرێت و دەسەڵات و هەژموونێکی بێسنووری پێدراوە.[1]

پرسەکە بووەتە پرسێکی گشتگیر و کۆمەڵگە ناچارکراوە پێی ڕازی بێت و تاکەکان بەزۆرەملێ ناچار بە گۆڕینی خودیان بکرێن، کە لەبنەڕەتدا ئامانجێکی سیاسیی لەپشتەوەیە و گوتاری

---

[1] في زمن الترويج للمثلية: كلامٌ يجب قوله، وتارێک لەسەر پێگەی متراس: https://bit.ly/3pj21d5

ناسنامەی ڕەگەزیی کردووە بە ئایدۆلۆجیای خۆی.[1]

ئەم بزووتنەوەیە تەنیا جیهانی گەوران بە ئامانج ناگرێت، بەڵکو باز دەداتە جیهانی منداڵانیشەوە، وەک کۆمپانیای (دیزنی)ی جیهانی -بۆ نموونە-، کە ڕایگەیاند نیوەی کەسایەتییەکانی گۆڕیوە بۆ کەسایەتی هاوڕەگەزباز و هێرشی کردە سەر ڕێکخراوی لێبووردەیی نێودەوڵەتی، کە بڕیاریدا یەکەمین فیلمی هاوڕەگەزبازیی دیزنی قەدەغە بکات.

ئەو گوتارەی هەر لە سەرەتای ژیانیانەوە شوێنی منداڵان دەکەوێت، تەنیا بەوە وازناهێنێت، کە مەیل و خواستەکانیان دەربخەن و وەک چارەنووس و تاقیکردنەوە قەبووڵی بکەن، بەڵکو پرسیارە ناخهەژێنەکە دەورووژێنێت، تا لە ساڵانی ناسەقامگیریی سۆزداریدا بە دیاریکردنی ناسنامەی ڕەگەزییەوە سەرقاڵ بێت و ئەو فیترەتەی خودا لەسەری بەدیی هێناوە بەشیاوی گفتوگۆی بزانێت و بیر لە گۆڕینی بکاتەوە؛ پاشان بۆی دەردەکەوێت، کە ئەمە ئەوە نەبووە بە دوایدا گەڕاوە و دووبارە بۆ لاکەی تر باز دەداتەوە.

بەم جۆرە ڕێچکەی ژیان و کەسایەتییەکەی دەگۆڕن و ناسنامەی ڕەگەزیی بۆ دەکەن بە (کەعبە)یەک، کە هاوشێوەی سەردەمی نەفامی بەچەپڵەڕێزان و هاتوهاوارەوە بەدەوریدا تەواف

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

بــکەن. بەڵــێ، بەڕاســتی ئــێمە لە بەردەم داماڵینی ئــاوەز و دەروونداڕووستیی نەوەیەکداین.[1]

ئێمە ئەمڕۆ لە بەردەم جەنگێکی هزری و کۆمەڵایەتیداین، کە هەڕەشەیە لەسەر فیترەتی مرۆڤ و دۆخی ڕەوشتیی کۆمەڵگە، لە ململانێیەکی توندداین لەگەڵ بزووتنەوەی هاوڕەگەزبازیدا، کە وردە وردە خەریکە بە دڵی کۆمەڵگەکەماندا ڕۆدەچێت و دەچێتە نێو ماڵەکانەوە، تا منداڵان بڕفێنێت و گەورەکان تێک بدات.

ئەگەر ئەمڕۆ بەخێرایی نەجووڵێین، ئەوا شێوەی پەیوەندییە سێکسییەکان و دۆخی کۆمەڵگە و خێزان و ڕەوشتی ئێمەیش لە ئاییندەیەکی نزیکدا دەبێتە کۆپییەک لە کۆمەڵگە خۆرئاواییەکان.

ئەم کتێبەی لە بەردەستی خوێنەری بەڕێزدایە، باس لە مێژوو و بنچینەی هاوڕەگەزبازی دەکات، لەگەڵ خستنەڕووی هۆکارەکانی پەیدابوون و پەرەسەندنی؛ هەروەها باس لە ئایدۆلۆجیای جێندەر و گۆڕینی ڕەگەز و ئەو خراپە و تاوان و هەژانە دەروونییانە دەکات، کە لێیانەوە پەیدا دەبن.

ئەم کتێبە بە شێوازێکی بابەتییانە و زانستییانە و ڕاشکاوانە و دوور لە لایەنگیری نووسراوە، هەرچی خوێنەری بەڕێز لە دووتوێی ئەم کتێبەدا دەیخوێنێتەوە قسەی زانستە و هیچ بۆچوونێکی کەسی و تایبەتیی تێکەڵ نەکراوە.

---

[1] في زمن الترويج للمثلية: كلامٌ يجب قوله، سەرچاوەی پێشوو.

پەروەردگـار پشـت و پەنامـان بێـت و یارمەتیـدەرمان بێـت بـۆ گوفتار و کرداری باش.

# سێکسی کۆم،
# چەند ڕاستییەک، کە دەبێت بخرێنەڕوو

لە سـاڵی ١٩٦٩ هەرزەکـاری ئەمریکـی (ڕۆبێـرت لـی ڕایفـۆرد Robert Lee Rayford) لە شـاری (سـاینت لـویس) لە ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـادا ژیـانی ئاسـایی خـۆی بەڕێ دەکـرد، ڕۆبێرت بە ژیانێکی ئاسایی ناسرابوو و زۆر جار دەیانوت شـەرمنە و زیرەکییەکەی سنووردارە و کەسێکی کۆمەڵایەتی نییە.

لە سـاتێکی دیـاریکراودا، کاتێـک ڕۆبێـرت لە تەمەنی پـانزە ساڵیدا بوو، چەند کارلێکێکی نائاسـایی لە جەسـتەیدا دەسـتیان بە کرد چالاکبوون، لەناکاوڕا جەسـتەی بە زیـپکە و پـۆرگ داپـۆشرا؛ گونەکانی تـووشی هەڵاوسـان بـوون و نـاوچەی حەوزی تووشـی ئـازارێکی زۆر هـات، هەڵاوسـانەکە وردە وردە هەمـوو لەشـی دادەگـرت و بەرەو قاچەکـانی دادەبەزی. بەتێپەڕبـوونی کـات، ڕوخسـاری ڕۆبێـرت زەردهەڵـگەڕا، جەسـتەی لەڕ و لاواز بـوو، توانـای جـووڵەی نەمـا. دوای ئەوە، تووشـی تەنگەنەفەسـی بـوو، کۆئەندامی بەرگریی لەشی دارما، پاشان بەهۆی نەخۆشیی سـیلەوە مرد.

دوای مردنی، پزیشکە پسپۆڕەکان دەستیان کرد بە پشکنین بۆ دەرکەوتنی هۆکاری مردنەکەی و بەوردی بە دوای ڕیشەی دۆخی نەخۆشییەکەیدا گەڕان. دواتر لایەنە پەیوەندیدارەکان لە ساڵی ١٩٦٩ ڕایانگەیاند، کە مردنی ڕۆبێرت یەکەمین حاڵەتی تووشبوونە بە ڤایرۆسی دابەزینی بەرگریی لەش - ئایدز HIV -، کە دواتر بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بڵاوبووەوە.

لەو کاتەوە ڤایرۆسی ئایدز بە شێوەیەکی مەترسیدار بەنێو ئەمریکییەکاندا بڵاوبووەوە و تا ساڵی ٢٠٠٢، گیانی نزیکەی (٤٢٠٠٠٠) ئەمریکیی کێشا، کە ئەو ڕێژەیە زۆر زیاترە لە ڕێژەی قوربانییانی ویلایەتەیەکگرتووەکان لە دووەم جەنگی جیهانیدا، کە نزیکەی (٤٠٤٠٠٠) ئەمریکی بوو.

بەڵام، هەروەک مامۆستای ئەنسرۆپۆلۆجیی ئەمریکی (گیلبێرت هێرد) باسی لێوە دەکات، کوژراوانی دووەم جەنگی جیهانی لە زیاتر لە نەوەیەک و زیاتر لە شوێنێکی جوگرافیدا بوون، کەچی بەپێچەوانەوە، قوربانییانی ڤایرۆسی ئایدز لە چەند ویلایەتێکی دیاریکراو و لە چەند کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا بوون؛ بەدیاریکراوی: لەنێو هاوڕەگەزبازاندا.[١]

بۆچی ئایدز لەنێو هاوڕەگەزبازاندا بڵاوبووەوە؟

---

[1] Gilbert Herdt & Brian De Vries, Gay, and Lesbian Aging: Research and Future Directions, p. 76

رەفتــاری هاوڕەگەزبــازی چ مەترســییەکی بــۆ ســەر جەســتەی مرۆڤ هەیە؟

ئەو مەترسی و نەخۆشییانە چین، کە بەهۆی هاوڕەگەزبازییەوە پەیدا دەبن؟

## فەوزای فرمانەکان:

لە ساڵانی شەستەکانەوە فەوزایەکی سێکسیی گەورە هاتووەتەکایەوە، پەیوەندیی سێکسیی بێ بەندوبار، فرەهاوسەری، خۆڕووتکردنەوە لە شوێنە گشتییەکاندا؛ ڕەفتاری نوێ و نامۆ لە چالاکییە سێکسییەکاندا.

بەڵام ئەو نـوێگەرییە بـێ باجـدان نەبـووە، چـونکە چەنـدین نەخۆشـی و پەتـای بە دوای خۆیـدا هێنـاون، کە بـوونەتە هـۆی گیانکێشـانی کەسـانێکی زۆر و تـا ڕۆژگـاری ئەمڕۆیشـیان کەسانێکی زۆر بەدەستیانەوە دەناڵێنن. گرفتەکە لەکوێـوە دەسـتی پێ کرد؟ چۆن ئەو نەخۆشیانە دروست بوون؟

هەر لە سـەرەتای بەدیهـاتنی بـوونەوەرەوە، پەروەردگـار نێـر و مێی بەدیهێناوە و لە هەر بوونەوەرێکدا ئەندامی وەچەخسـتنەوەی دانـاوە، کە نێـر و مـێ تەواوکەری یەکـترن؛ لە هەردوو ڕەگەزەکەیشـدا ئەنـدامی خسـتنە دەرەوەی پاشـەڕۆی دانـاوە، کە ئەرکی پاککردنەوەی جەستەیە لە پاشەڕۆی خواردن و خواردنەوە.

گـرفتەکە لێـرەوە دەسـتپێدەکات، کە مـرۆڤ ئەنـدامێک بـۆ فرمانێک بەکاربهێنێت، کە بۆ ئەوە بەدی نەهێنرابێت.

ئەگەر کەسـێک دەمـی بـۆ پـاککردنەوەی لەش لە ژەهرەکـان

بەکاربهێنێت سەرکەوتوو نابێت، چونکە ئەمە فرمانی جگەرە. هەرکەسێکیش سییەکانی بۆ بەرگریی لەش بەکاربهێنێت ناتوانێت و بۆی ناچێتە سەر، چونکە ئەمە فرمانی لیمفە ڕژێنەکانە.

بە هەمان شێوە؛ ئەندامەکانی زاوزێ بۆ فرمانی تایبەتی خۆیان بەدیهێنراون و لە خزمەت وەچەخستنەوەدان.(١)

ئەندامی دەردانیش (کۆم) بە هەمان شێوە، لە ماسوولکە پێکهاتووە و دەچێتەوە یەک و جووڵەی هەناو و تۆڕی دەمارەکان و ئەنزیم و شانەکان و کۆئەندامی هەرس بگشتی بەوەوە بەندن.

ئەگەر ڕۆڵ و ئەرکەکان پێچەوانە بکرێنەوە و کۆئەندامی هەرس بکرێتە وەرگری گۆڕانکارییەکانی کۆئەندامی زاوزێ، چی ڕوودەدات؟

بە گوزارشتێکی تر؛ چی بەسەر کۆئەندامی هەرسدا دێت کاتێک تەنێکی نامۆی لە دەرەوە بخرێتە ناو، بۆ هیچ ئامانجێکیش نا جگە لە چێژ وەرگرتنی سێکسی بەوەی پێی دەوترێت سێکسی کۆم؟!

لە سەرەتادا، شانە ناوخۆییەکانی دیواری ڕیخۆڵەڕێکە دەشێوێن، ئەمەیش دەبێتە هۆی خوێنبەربوونی ناوەکی، کە

(1) Geist RF. Sexually related trauma. Emerg Med Clin North Am. 1988 Aug: 6(3): 439-66. PMID: 3292221.

لەوانەیە بە چاو نەبینرێت، بەتێپەڕبوونی کات زیپکە دروست دەبێت و کێم و زووخاوی تێدا کۆدەبێتەوە و تووشبوونی میکرۆبی و ڤایرۆسی ڕوودەدات.

بە بەردەوامبوونی سێکسی کۆم، کۆئەندامی هەرس تووشی ئەوە دەبێت، کە پێی دەوترێت هاتنەدەرەوەی کۆم و ڕیخۆلەڕێکە دێتە دەرەوەی کۆم و ماسوولکەی داخەری کۆم، کە پاشەڕۆ کۆنترۆڵ دەکات، تێکدەچێت؛ ئەمەیش وا دەکات پاشەڕۆ بەبێ ویستی کەسەکە بێتە خوارەوە و دەربچێت.

دواتر خوێنە مەییوەکە لەگەڵ هەوکردن و خوێنبەربوونی ناوەکی و زووخاوی کۆبووەوە و میکرۆبەکان و پاشەڕۆ و شانە تێکچووەکان و پاشماوەی ماسوولکە تێکچووەکان یەکدەگرن و ژینگەیەکی تەواو گونجاو بۆ گەشەکردنی میکرۆب و ڤایرۆسەکان دروست دەکەن، بەم جۆرە ئەنجامدەری سێکسی کۆم مەترسیی تووشبوون بە نەخۆشییە گوازراوەکانی دەکەوێتە سەر، وەک: گۆنۆریا و هێرپسی ئەندامەکانی زاوزێ و کلامیدیا و ئایدز و... هتد.

ئەگەر بمانەوێت لەو ڕاستییە زانستییانە بکۆڵینەوە، ئەوا دەبێت سەرنجی ئامارەکانی کۆمەڵگەی هاوڕەگەزبازان بدەین، کە سێکسی کۆمیان تێدا بڵاوە.[١]

---

[1] Markland AD, Dunivan GC, Vaughan CP, Rogers RG. Anal Intercourse and Fecal Incontinence: Evidence from the 2009-2010 ←

## کۆمەڵگەیەکی مەترسیدار:

مەترسی سێکسی کۆم تەنیا تووشبوون نییە بە هەندێک پەتاو نەخۆشی، بەڵکو زۆرجار دەگاتە ئاستی مردن.

ڕاپۆرتێکی ساڵی ٢٠١٨ی نەتەوە یەکگرتووەکان دەریخستووە، کە ئەو نێرانەی سێکس لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیاندا دەکەن، ٢٨ جار ئەگەری تووشبوونیان بە نەخۆشیی ئایدز زیاترە لە ئەنجامدەری لەگەڵ ڕەگەزی بەرانبەردا. سەرەڕای نزمبوونەوەی ژمارەی تووشبوانی ئایدز لە ٣٫٤ ملیۆن لە ساڵی ١٩٩٦ بۆ ١٫٨ ملیۆن لە ساڵی ٢٠١٧دا، کەچی هێشتا ئەنجامدەرانی سێکسی کۆم ئەگەری تووشبوونیان بە نەخۆشیی ئایدز زیاترە، بە هەمان شێوە لە ئافرەتانی ڕەگەزگۆڕاودا، بەپێی ڕاپۆرتی جیهانی لە ساڵی

بەگوێرەی ڕاپۆرتی (The British Academy)، زۆربەی قوربانییانی ئایدز لە بازنەی هاوڕەگەزبازاندان. لە ساڵی ١٩٩٥ ١٠%ی هاوڕەگەزبازانی ئەمریکا گیانیان لەدەستدا، تا وای لێ

National Health and Nutrition Examination Survey. Am J Gastroenterol. 2016: 111(2): 269-274.

(1) Men with same-sex partners 28 times mire likely to get HIV – U.N: https://shorturl.at/abhUV

هات ڕێژەی قوربانییانی هاوڕەگەزبازی بەپێی هەندێ لە ئامارە ئەکادیمییەکان گەیشتە ٣٣%.(١)

ڤایرۆسی دابەزینی بەرگری لەش (ئایدز) کۆتا ڤایرۆس نییە، بەپێی توێژینەوەیەکی ساڵی ٢٠١١، ئەو نێرانەی سێکس لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیاندا دەکەن، ڕێژەی تووشبوونیان بە ڤایرۆسی هەوکردنی جگەر (Hepatitis) و ڤایرۆسی گرێی کۆم (HPV) زیاترە، تەنانەت توێژینەوەیەک باس لەوە دەکات، کە نەخۆشییە باوەکانی هەناویش زیاتر لەنێو هاوڕەگەزبازاندا باون.(٢)

نەخۆشییە بڵاو و گوازراوەکانی نێو هاوڕەگەزبازان، تەنیا نەخۆشییەکانی کۆئەندامی زاوزێ ناگرنەوە، بەڵکو چەند نەخۆشییەکی تریش دەگرنەوە، کە لە ڕێی پەیوەندیی سێکسییەوە نەگوازرێنەوە؛ وەک نەخۆشیی شیگیلۆس (Shigellosiss) و سالمۆنێلا (Salmonellosis) و گیاردیا (Giardiasis) و ئەمیباسیس (Amebiasis).(٣)

---

(1) Martin P. Levine, peter M. Nardi, John H. Gagnon, In Changing Times: Gay Men and Lesbians Encounter HIV/AIDS, p.

(2) Kenneth H, Mayer, Sexually Treansmitted Diseases in Men Who Have Sex with Men, Clinical Infections Diseases, Valume 53, Issue supp1-3, 15 December 2011, pages S79-S83.

(3) Baker RW, peppercorn MA. Enteric diseases of homosexual men. Pharmacotherapy. 1982 jan-Feb;2(1):32-42. Doi: 10.1002/j.1875-9114. 1982.tb03170. x. PMID: 6765390

## سێکسی کوشندە:

ڤایرۆسەکان یەکێکن لە شوێنەوارە کوشندەکانی سێکسی کۆم، کە تەنانەت ئەگەر ئەنجامدەرانی لە ڤایرۆسەکەیش دەربازیان ببێت، ئەوە شێرپەنجە جیاوازەکان بەدوایانەوەن. بەپێی توێژینەوەیەک، کە سەبارەت بە هۆکارە یاریدەدەرەکانی تووشبوون بە شێرپەنجەی کۆم ئەنجامدراوە، دەرکەوتووە هاوڕەگەزبازی هۆکارێکی سەرەکی و مەترسیدارە بۆ تووشبوون بە شێرپەنجەی کۆم و ئەگەری تووشبوونیان ١٧ ئەوەندەی نێرانی ئاسایی

سەرباری ئەوەیش، چەند توێژینەوەیەکی نوێ دەریانخستووە، کە پەیوەندیی سێکسیی نێوان هاوڕەگەزبازان هۆکارێکی کاریگەرە بۆ تووشبوون بە شێرپەنجەی سەر و مل و کۆم، وەک توێژینەوەکەی گۆڤاری (Oncology)[٢] دەریخستووە.

ئەمە جگە لەوەی نەخۆشییە باوەکانی تری ئەندامەکانی زاوزێش لەنێو هاوڕەگەزبازاندا زیاترن وەک لە کەسانی ئاسایی، بۆ نموونە: نەخۆشی سوزەنک (سیلان – Gonorrhea)، کە نەخۆشییەکی بەکتریاییە و تووشی ئەندامی زاوزێ دەبێت، زیاتر

---

[1] Daling JR, Weiss NS, Hislop TG, Maden C, Coates RJ, Sherman KJ, Ashley RL, Beagrie M, Ryan JA, Corey L. Sexual practicesm sexually transmitted diaseases, and the incidence of anal cancer. N Engl J Med. 1987 Oct 15;317(16):973-7

[2] Anna Azvo;inskey, Link Between Sexual Orientation and Cancer, ONCOLOGY Vol 25 No 7

لەنێو نێرانی هاوڕەگەزبازدا بڵاوە و ڕێژەی گواستنەوەی بەهۆی هاوڕەگەزبازییەوە دەگاتە ٥٠%.

لە توێژینەوەیەکی تردا، کە لە ساڵی ٢٠٠٦دا بڵاوکراوەتەوە، بەربڵاویی هەوکردنی بۆریی میز لە پیاواندا ( Acute Male Urithritis) کراوەتە بواری توێژینەوەکە و توێژینەوەکە لە وڵاتی فەڕەنسا و بەدرێژایی ١٣ ساڵ ئەنجام دراوە و گەیشتووەتە ئەو دەرئەنجامەی، کە هاوڕەگەزبازان لە هەموو چینەکانی تر ئەگەری تووشبوونیان زیاترە بە نەخۆشییە گوازراوەکان.[١]

یەکێک لە جیاوازییە سەرسووڕهێنەرەکان لەم بابەتەدا ئەوەیە، کە هاوڕەگەزبازان بە بەراورد بە کەسانی ئاسایی، تەمەنیان بچووکتر و هەڵگری نەخۆشیی زیاترن و هەر یەکێکیان لانیکەم دوو هاوڕەگەزیان هەیە، کە سێکسیان لەگەڵدا ئەنجام دەدەن.

دیارترین هۆکارەکانی تووشبوون بە هەوکردن بریتین لە بەکتریای گۆنۆریا و کلامیدیا تراکۆماس و مایکۆپلازما جێنیتالیوم و جۆرەکانی تری بوونەوەرە وردەکان، کە بە مایکرۆسکۆپ نەبێت نابینرێن.

بە هەمان شێوە، لە ساڵی ٢٠١٦دا توێژینەوەیەکی گەورەی زانستی، کە لە هەموو توێژینەوەکانی تری پێش خۆی گەورەترە،

---

[1] Baker RW, peppercorn MA. Enteric diseases of homesexual men. Pharmacotherapy. 1982 Jan-Feb;2(1):32-42. Doi: 10.1002/j.1875-9114. 1982.tb03170. x. PMID: 6765390

ئەنجـــام دراوە و لە گۆڤـــاری ئەمریکـــی بـــۆ کۆئەنـــدامی هەرس بڵاوکراوەتەوە، کە ئەم گۆڤارە لە بـواری خۆیـدا لە پـلەی سـێیەمی گۆڤارە زانستییەکان دێت. تـوێژینەوەکە لە پەیوەنـدیی سێکسـیی کۆڵیوەتەوە لە ڕووی کۆمەوە، چ لەنێو پیـاوان خۆیانـدا بێـت، یـان لەگەڵ ئافرەتانـدا[1]، کە دەبێـتە هـۆی نەمـانی کـۆنترۆڵ بەسـەر پاشەڕۆدا و ڕێژەکەی دوو ئەوەنـدەی کەسـانی ئاسـاییە. ئەمەیـش بەگوێرەی قسەی زانایان بەهۆی فراوانبوونی دەرچەی کۆم و کشان و تێکچوونی ماسوولکە داخەرەوەکانی دەرەوە و ناوەوەی کۆم (کە دوو ماسوولکەن پاشەڕۆ کۆنترۆڵ دەکەن، بەڵام بەهـۆی سێکسـی کـۆمەوە دەکشـێن و نـایەنەوە یەک، چـونکە بـۆ بەتـاڵکردنەوەی پاشەڕۆ دانراون، نەک بۆ بەتاڵکردنەوەی ئارەزوو[2].

بەم شێوەیە سێکسی کۆم تەندروستیی مرۆڤ وێـران دەکـات و بەرگـــری و هێـــزی لەشـــی پەک دەخـــات و ژینگەیەکـــی وا دەڕەخسـێنێت، کە چەنـدین جـۆر بەکتریـا و ڤـایرۆس و لەوانەیە خانەی شێرپەنجەیش تێیدا گەشە بکەن؛ ئەمەیش هەمووی بەهـۆی ئەوەوەیە، کە کۆئەنـدامی هەرس بـۆ فرمـانێکی تـری نەگونجـاو بەکاردەهێنرێت.

---

[1] Massari V, Dorleans Y, Flahaut A. persistent increase in the incidence of acute male urethritis diagnosed in general practices in France, Br J Gen pract. 2006;56(523):110-114

[2] Markland AD, Dunivan GC, Vaughan CP, Rogers RG. Anal Intercourse and Fecal Incontinence: Evidence from the 2009-2010 National Health and Nutrition Examination Survey. Am J Gastroenterol. 2016: 111(2): 269-274. Doi:10.1038/ajg.2015.419

پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگار، کە شتە پاک و سوودبەخشەکانی بۆ حەڵاڵ کردووین و شتە پیس و بێکەڵکەکانی لێ حەرام کردووین.

پەروەردگار لە هەموو ئەوانە ڕازی بێت، کە دەست بە فیترەتەوە دەگرن و شوێن ڕێگەی ڕاست دەکەون و گوێڕایەڵیی خودا و پێغەمبەرەکەی دەکەن، ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ﴾ (الأعراف: ١٥٧)

واتە: "ئەو کەسانەی دەکەونە دوای ئەو فروستادەیە، کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارە، ئەوەی دەیبینن لای خۆیان لە تەورات و ئینجیلدا نووسراوە و ئەمریان پێ دەکات بە چاکە و نەهییان لێ دەکات لە خراپە و خواردەمەنیی پاک و پوختیان بۆ حەڵاڵ دەکات و خواردەمەنیی پیسیان لێ حەرام دەکات، ئەو بارە قورسانەی ئەوسا بەکۆڵیانەوە بوو لادەبات و باری سەرشانیان سووک دەکات".

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕاستی فەرموو، کە ئامۆژگاریی کردین و لە مەترسیی خراپەکاری ئاگاداری کردینەوە: (لم تَظْهَر الفاحشةُ في قوم قَطُّ ؛ حتى يُعْلِنُوا بها؛ إلا فَشَا فيهمُ الطاعونُ والأوجاعُ التي لم تَكُنْ مَضَتْ في أسلافِهِم الذين مَضَوْا).

واتە: "هەرکات خراپەکاری لە هەر گەلێکدا بڵاوبووەوە و

بەئاشــکرا ئەنجامیانــدا، ئەوا تــاعوون و ئــازار و نەخۆشــی وەهــا لەناویاندا بڵاودەبێتەوە، کە لە گەلانی پێش خۆیاندا نەبووبێت.

# هاوڕگەزبازی و جەنگ
# لە دژی سروشتی مرۆڤایەتی

(وەک پسپۆڕێکی دەروونی، کە چارەسەری نێری هاوڕەگەزباز دەکەم، ئەو کاتە هەستم بە سەرسوورمان کرد، کە بینیم بزووتنەوەی هاوڕەگەزبازان خەریکن بڕوا بە جیهان دەهێنن بەوەی کەسی هاوڕەگەزباز پێویستی بە تێگەیشتنێکی تایبەت هەیە!)

(جوزێف نیکۆلۆسی)

لەم بەشەدا شوێنپێی قۆناغە مێژووییەکانی بزووتنەوەی هاوڕەگەزبازی هەڵدەگرین، دواتر قسە لەسەر لۆبییەکانی هاوڕەگەزبازی دەکەین و ڕۆڵیان لە چەسپاندنی هاوڕەگەزبازی و دەرکردنی یاسا و بڵاوکردنەوەی توێژینەوەی درۆیینە بۆ چەسپاندن و بە ئاسایی سەیرکردنی ڕەفتارەکانی هاوڕەگەزبازان دەخەینەڕوو.

بانگەشەی ئەوە ناکەین، کە ئەوەی لەسەر ئەم کاغەزە دەیخەینەڕوو، بەتایبەت لایەنە مێژووییەکەی، توێژینەوەیەکی گشتگیرە بۆ بابەتەکە؛ بەڵکو ئامانجمان دیاریکردنی گرنگترین پرس و ڕووداوە سەرەکییەکانە، کە ڕۆڵێکی سەرەکییان لە دەرچوونی

هاوڕەگەزبازی بەئاشکرایی بۆ خەڵک و گوێزرانەوەی لە تاوانەوە بۆ یاسا و ئەنجامدانی بەئازادی و بەبێ کۆتوبەند گێڕا. ئامانجمان دیاریکردنی ئەو پرسانەیە و تیشکیان دەخەینە سەر، بۆ ئەوەی پاشخانێکی باشی زانیاریمان هەبێت و ببێتە دەروازەیەک بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکە و ئەو بارودۆخەی پێیگەیشتووین.

## پێناسە:

بــزووتنەوەی هاوڕەگەزبــازان، یــان بــزووتنەوەی ئــازادکردنی هاوڕەگەزبــازان: بزووتنەوەیەکــی مەدەنیــی کــۆمەڵایەتین، کە بەرگـــــری لە مـــــافی (هاوڕەگەزبـــــاز و دوانە ڕەگەزی و ڕەگەزگۆڕاوەکــان دەکەن). بــزووتنەوەکە هەوڵــی لابــردنی ئەو یاســایانە دەدات، کە ڕێگــرن لە بەردەم پەیوەنــدییە سێکســییە نامۆکان و سزایان لەسەر ئەنجامدانی داناوە و بانگەواز دەکەن بـۆ کۆتاییهێنان بە دژایەتیکردنی ئەو کۆمەڵانە و دابینکـردنی شـوێنی نیشتەجێبوون و مافە مەدەنییەکانیان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

## پاشخانێکی مێژوویی:

لە سییەکانی سەدەی دەیەم، لەسەردەمی هێنریی هەشتەمدا، ئینگلتەرا یاسای سزادانی نێربازیی دەرکرد، کە بریتی بوو لە لەسێدارەدان، ئەم یاسای سزادانە بەردەوام بوو، تا ساڵی ١٨٦١؛ دوای ئەوە بە دوو دەیە، لە ساڵی ١٨٨٥ پەرلەمان بە فەرمانی (هێنری دو پری لاپۆشێر) گۆڕانکارییەکی لە یاساکەدا کرد، کە تاوانی (خراپەی ئاشکرا)ی پەیوەندییەکانی نێوان نێرەکانی بە تاوان ناساند، کە دادگا بۆی هەیە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات.

بەڵام لە ئەڵمانیا، لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا (بڕگەی ١٧٥) هەموو پەیوەندییەکی نێوان نێرەکانی قەدەغە کرد و ئەنجامدەرانی ڕووبەڕووی زیندانی و لەدەستدانی مافە مەدەنییەکان دەکردەوە.[١]

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا، زانای هەنگاری (کارۆلای بنکریت) چەمکی (هاوڕەگەزبازی Homosexuality)ی دانا، وەک ئاماژەیەک بۆ لادانی سێکسی لە نێوان نێر و نێر، مێ و مێ، تا وردە وردە شوێنی چەمکی نێربازی بگرێتەوە؛ بەوپێیەی

---

[١] سەرچاوەی پێشوو.

چەمکێکی زبرە و بێلایەنانە نییە. دواتر (هاوڕەگەزبازی) وەک چەمکێکی پشتپێبەستراو هاتەکایەوە و لە بوارە مەعریفییەکاندا پشتی پێ بەسترا، وەک زانستی دەروونناسی و پزیشکی و ئەنسرۆپۆلۆجیا.[1]

لەگەڵ هاتنی سەردەمی بووژانەوەی پیشەسازی، وردە وردە دەسەڵاتی کڵێسا بەرەو لاوازی ڕۆیشت، یاساکانی کڵێسا هەڵوەشێنرانەوە، کە هاوڕەگەزبازیی وەک تاوانێکی گەورە هەژمار دەکرد؛ هەروەها ئەو سزایانەیش لادران، کە ئەو یاسایانە فەرزیان کردبوون، بەمەیش هاوڕەگەزبازی بوو بە جێی گفتوگۆ لە ناوەندە پزیشکی و دەروونییەکاندا و بوو بە دیاردە و پەیوەندیکردنی فێرخوازان بەو قوتابخانانەی بەشە ناوخۆییان تێدایە و مانەوەیان تێیاندا دوور لە چاودێریی خێزانی و پەروەردەیی، هۆکارێکی کاریگەری بڵاوبوونەوەی بوون.[2]

کۆمەڵگەی هاوڕەگەزبازان لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا جۆرێک لە ئازادییان وەرگرت، لەو ماوەیەدا چەندین ڕێکخراو و بزووتنەوەی مەدەنی پەیدابوون، کە بەرگرییان لە هاوڕەگەزبازان و مافەکانیان دەکرد. دوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهانی،

---

[1] الطريق إلى دين المثلية والطريق المضاد، وتارێکی (محمد خير موسى)یە لەسەر پێگەی الجزيرة مباشر.
[2] سەرچاوەی پێشوو.

بڵاوکـراوە هاوڕەگەزبازییەکـان لە زۆرێـک لە شـارە گەورەکـانی ئەڵمانیادا زیادیان کرد و دەسەڵاتداران چاوپۆشی و ئاسانکارییان بۆ ژیانی شەوانەیان دەکرد.

لە شیکاگۆیش، (هێـنری گێـربەر Henry Gerber) کـۆمەڵەی مافەکـانی مـرۆڤ (The Society for Human Rights)ی دامەزراند، کە یەکەمین ڕێکخراوی داکۆکیکەر بـوو لە مافەکـانی هاوڕەگەزبازان لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا.(١)

لەگەڵ هـاتنی نیـوەی دووەمـی سـەدەی بیسـتەمدا، ڕێکخـراوە داکۆکیکەرەکـــان لە مافەکـــانی هاوڕەگەزبـــازان زیـــادبوون و بڵاوبوونەوە؛ ئەوەتا لە ساڵی ١٩٤٦ لە هۆڵەنـدا ناوەنـدی ( Cultur en Ontspannings ناوەنــدی ڕۆشــنبیری و خۆشــگوزەرانی) دامەزرا، کە ئامـــانج لە دامەزرانـــدنی ئەو ڕێکخـــراوە ئەوە بـــوو سەرپۆشێک بێت بۆ کۆمەڵەیەکی مـافپەروەر بـۆ بەرگریکـردن لە مافی هاوڕەگەزبازان.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکانیشـدا (هـاری هـای Harry Hay) لە ساڵی ١٩٥٠ لە لۆس ئانجلۆس کۆمەڵەی (ماتاشـین Mattachine Society)ی دامەزراند بۆ بەرگریکردن لە نێربازان. دوای پێنج ساڵ

---

(1) HENRY GERBER – Chicago LGBT Hall of Fame: https://shortur1.at/dfhor
LGBTQ Rights Milestones Fast Facts: https://shortur1.at/bfmtV

ڕێکخراوی (کچەکانی بیلیتس Daughters of Bilitis) دامەزرا. لە ساڵی ١٩٥٥ لە سان فرانسیسکۆ، کە بوو بە یەکەمین ڕێکخراوی مەدەنی بۆ بەرگریکردن لە هاوڕەگەزبازی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا.[1]

لە ساڵی ١٩٥٧ لە بەریتانیا، ڕاپۆرتی لیژنەی بەڕێوەبردنی تایبەت بە تاوانە هاوڕەگەزبازییەکان و دەستدرێژیی سێکسی ناسراو بە ڕاپۆرتی (Wolfenden) بڵاوکرایەوە، کە تێیدا هاتبوو: (تاوانبارکردن و سزادانی هاوڕەگەزبازان، دەستدرێژیکردنە بۆ سەر ئازادیی مەدەنی)، هەروەها ڕاپۆرتەکە بانگەوازی دەکرد بۆ لادانی سزای پەیوەندیی هاوڕەگەزبازی لە نێوان کەسانی پێگەیشتوودا، کە بە ڕەزامەندیی هەردوولا بێت لە یاساکانی سزاداندا. دوای ١٠ ساڵ یاساکە چووە بواری جێبەجێکردنەوە.[2]

لە سەرەتای حەفتاکاندا، پەنجا کۆمەڵە لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا پەیدابوون، کە پشتیوانی هاوڕەگەزبازانیان دەکرد، ئەمە بوو بە هۆکارێکی یەکلاکەرەوە بۆ ئەو گۆڕانە گشتگیرە، کە بە (یاخیبوونی ستونوۆڵ Stonewall riots) ناسراوە و لە ٢٨ی یۆنیۆدا دەستی پێ کرد؛ دوای ئەوەی پۆلیسی نیویۆرک هێرشی کردە سەر یەکێک لە یانەکانی کۆبوونەوەی

(1) Britannica: https://shortur1.at/efhV7
(2) The Cabinet papers | Before and after the Wolfenden Report: bit.1y/3c0EQB5

هاوڕەگەزبازان، کە بە (Stonewall club) ناسرابوو، خۆپیشـاندان و چالاکی تێکـدەرانە دەسـتیان پـێ کـرد و بـۆ مـاوەی شـەش ڕۆژ بەردەوام بوون. ئەو ڕووداوە بـووە هـۆی سـەردەمی دووورودرێـژی چالاکییە نهێنییەکان و وای کرد هاوڕەگەزبازان بەئاشـکرا و بەبـێ ترس و شەرم بێنە ناو ژیانی گشتییەوە.[1]

لەو کـاتەوە وردە وردە نیشـانە سـەرەتاییەکانی درووسـتبوونی ڕێپێـوانی کەرامەت/ فەخـر بـۆ هاوڕەگەزبـازان ( Gay pride parades) لە شارە گەورەکاندا دەستیان پـێ کـرد و لە ٢٧ و ٢٨ی مانگی حوزەیران/ یۆنیۆی سـاڵی ١٩٧٠ لە هەریەک لە شـیکاگۆ و سان فرانسیسکۆ و نیویۆرک و شارەکانی تر ڕێپێوانەکان دەسـتیان پێ کـرد، لە سـاڵی ١٨٨٧ لە شـاری واشـنتۆن نـزیکەی ٦٠٠ هەزار کەس بەشدارییان کرد لە ڕێپێوانی داواکردنی یەکسانیدا.[2]

---

[1] أوسم وصفي، شفاء الحب.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

## ژیارێک دژ بە مێژوو.. بەرزبوونەوەی کۆمەڵایەتی بۆ ئەنجامدانی هاوڕەگەزبازی:

لە توێژینەوەیەکدا، کە دکتۆر (جەی دین ئۆنوین J.D. UNWIN) مامۆستای زانستە مرۆڤایەتییەکان لە زانکۆی ئۆکسفۆرد ئەنجامیداوە، تێیدا ٨٦ کلتووری جیاوازی بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی وەرگرتووە، لە دەرئەنجامی توێژینەوەکەیدا ئۆنوین ئەوەی خستۆتەڕوو، کە دامەزراندنی ژیار بەردەوام پەیوەست بووە بە ڕێکخراوی ڕەگەزی و چالاکیی سێکسیی بەرزەوە؛ واتە بە کورتکردنەوەی پەیوەندی لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا.

هەروەها توێژینەوەکە ئەوەیشی دەرخستووە، کە (بێخاوەنی سێکسی - المشاعية الجنسية) و بەرزبوونەوەی (چالاکیی سێکسیی ئازادانە) بەردەوام هۆکاری دارمانی ژیار و شارستانییەتەکان بووە و چەندین جار لە مێژوودا ئەوە دووبارە بووەتەوە.[١]

کەچی ئەمڕۆ، نموونەی خۆرئاوایی نزیکە لە ئەزموونە مێژووییەکە، چونکە دەرکەوتنی لەناکاو و پەرەسەندنی بەم

---

[١] بوب بيركت: الأخلاق الجنسية وإمكان الحضارة: https://shortur1.at/nrty2

خێـــراییە، زۆر لەوە گەورەتـــرە، کە لە ڕووی بۆمـــاوەییەوە بێـــتە بەرهەم.

ئەگەر لێـــی ورد ببیـــنەوە، بۆمـــان دەردەکەوێـــت، کە وانەی وەرگیـــــراو لە مێـــژووی ڕۆشـــنبیریی گەلان پـــێمان دەڵێـــت هاوڕەگەزبـازی ڕەفتـارێکی خـودیی بەدەسـتهاتووە (واتە لە ڕێـی بۆمـاوەیی و هۆرمـۆن و جینـاتەوە نـاگوازرێتەوە). لە بەشـەکانی دواتردا بە وردەکاریی زیاترەوە باس لەم بابەتە دەکەین.

ئەگەر هاوڕەگەزبازی لەبنەڕەتدا بۆماوەیی بێت، ئەوا بە هەمـان ڕێژە لە هەموو نەتەوە و کلتوورەکاندا دەردەکەوێت. بەڵام دەبینـین بابەتەکە بەم جۆرە نییە، ئەوەتا چەندین نەتەوە و کلتوورمـان هەن، کە ڕەفتـاری هاوڕەگەزبازییـان تێـدا نیـیە و لەمێژوویشـیاندا نەبووە.[1]

بەدرێژایی مێژوو هیچ کات هاوڕەگەزبازان وەک ئێستا ژمارەیان زۆر نەبووە، ئەمە هەمان ئەو واتایەیە، کە (جۆزێف نیکۆلۆسی Joseph Nicolosi) پسپۆڕی چارەسەری دەروونی باسی کردووە، وتوویەتی: (ئەوکات هەموو خەڵک لە سەرانسەری جیهاندا کۆک بوون لەسەر ئەوەی، کە فرمانی سروشتی شتەکان بەپێی دیزاینەکەیانە. ئەوسا شتێک نەبوو بەناوی کەسی هاوڕەگەزباز، چونکە ڕەگەزی مرۆڤایەتی بەوە ناسراوە، کە

[1] My genes made me do it, Chapter:6, p: 104-108

مەیلێکی فیتریی بۆ ڕەگەزی بەرانبەر هەیە و لە ماوەی ئەو ٣٠ساڵەی لە بواری کردەیی پیشەکەمدا بەسەرم بردووە، بۆم دەرکەوتووە، کە ئەم تێگەیشتنە ئەنسرۆپۆلۆجییە، کرۆکی حەقیقەتە).[١]

هەروەها (جۆن دی ئیمیلیۆ John D. Emilio) مامۆستای مێژوو لە زانکۆی ئیلینۆی لە شیکاگۆ، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە ئەفسانەی مەیلە سێکسییەکان بۆ مەرامی سیاسی بەکارهێنراوە و هاوڕەگەزبازان زادەی مێژووی پەیوەندیی سەرمایەداری و سیستمی کاری ئازادانەیانە. هەروەها دی ئیمیلیۆ وای دەبینێت، کە ئەم دۆخە بووەتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی بنچینەی کۆنی خێزان، کە کرۆکی کۆمەڵگە بوو.[٢] ئەوسا چالاکیی سێکسی بۆ زیادبوون و وەچەخستنەوە بوو، ئەوکات خێزان کۆڵەگەی چالاکیی ئابووری و کۆمەڵایەتی بوو، بەڵام دوای هەژموونی سەرمایەداری، خەڵک دابەشبوون بۆ تاک و بانگەشەی ئەوەیان کرد، کە دەتوانن خاوەن ناسنامەی تاکەکەسی بن و بەتەنیا بژین.[٣]

---

[١] جوزيف نيكولوسي: الصدمة النفسية كركن أساس عند الرجال مثليي الميول، من: رحلة رجل ت. شهاب الدين الهواري وآدم رمزي: ص ٩

[٢] خێزانی ناوک (کرۆک): لە ژن و مێرد و منداڵەکان پێکدێن، جیاوازە لە خێزانی گەورە، کە مام و پوور و باپیرە و داپیرە نزیکەکانیش دەگرێتەوە.

[٣] جون ديميليو: الرأسمالية والهوية المثلية، ت. العنود سعد: https://bit.1y/3dlgHPS

بۆچــــوونەکەی مامۆســـــتا جـــۆن هاوشـــێوە و نـــــزیکە لە دەرئەنجــامەکەی (جۆزێــف موســـعەد)، مامۆســـتای مێـــژووی بیرۆکەکـان لە زانکـۆی کۆلۆمبیـا، کە لەکتێبەکەیـدا ( Desiring Arabs)دا دەڵێـــــت: (دوانەیــــــی ڕەگەزی/ ڕەگەزگۆڕاوەکـــــان، دوانەییەکـی ئیمپریـالیی سـەرمایەدارییە و خۆرئـاوا دایهێنـاوە و هەوڵیـداوە بەســەر گەلانی تــردا بیســـەپێنێت، بە پاسـاوی ئەوەی شـــتێکی جیهـــانییە، کەچـــی ئامـــانجی هەژمـــوون و زاڵبـــوونی لەپشتەوەیە). ئەم پۆلێنکردنە پۆلێنکردنێکی کلتــووری خۆرئـاوایيە و موسعەد بە جەختکردنەوە لەگوتاری ئەبســتمۆلۆجی و سیســتمی مەعریفــی پێــی گەیشـــتووە، کە (هاوڕەگەزبـــازان) پشـــتی پـــێ دەبەستن، نەک بە جەختکردنەوە لە گوتاری سیاسی.[١]

---

[١] قراءة في كتاب اشتهاء العرب، موقع نماء: https://shortur1.at/ciKN5

## لۆبییەکانی هاوڕەگەزبازی، لە ڕقی زانست و حەقیقەت:

لە ناوەڕاستی نەوەدەکانەوە جیهانی خۆرئاوا بەرزبوونەوەیەکی خێرای بزووتنەوە سیاسییەکانی بەخۆیەوە بینیوە، ئەو بزووتنەوانە (تێکۆشانی هاوڕەگەزبازان) و هەوڵدان بۆ ڕەوایەتیدان بە هاوسەرگیریی هاوڕەگەزبازان و بانگەوازکردن بۆ ڕاگەیاندنی مەیل و ئارەزووەکانیان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بێ هیچ شەرم و ترس و سڵکردنەوەیەک. بەم جۆرە هاوڕەگەزبازی بوو بە ڕەفتارێک و ئاراستەیەکی سروشتی و لە قوتابخانە و زانکۆکاندا وەک مەیلێکی سروشتی و فیتری دەخوێنرێت.

لۆبییەکانی بزووتنەوەی هاوڕەگەزبازان لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە دەستیان کردووە بە چالاکییەکانیان و لە ماوەیەکی کورتدا هەژموونی خۆیان بەسەر چەندین بواردا سەپاند: وەک ڕاگەیاندن، سیاسەت و بوارەکانی پزیشکیی دەروونیی زانستی.

هەروەک دکتۆر (أوسم وصفي) لە کتێبەکەیدا (شفاء الحب) باسی کردووە، کە: (هەژموونی لۆبییەکانی هاوڕەگەزبازی بەڕوونی بەسەر ڕاگەیاندن و بوارە پزیشکییەکانەوە دەرکەوت،

ئەمە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە و لە ڕێی کۆبوونەوەکانی کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ پزیشکیی دەروونی، کە بەڵگەی دەستنیشانکردنی هەژانە دەروونییەکان لەوێوە دەردەچێت).[1]

چارەسەرکەری دەروونی، جۆزێف نیکۆلۆسی، نکوولی لەم جەنگە دژ بە سروشتی مرۆڤایەتییە دەکات، کە لە ژێر ناونیشانی مافەکانی مرۆڤ و ڕاستڕەویی سیاسیدا دەکرێت، دەڵێت: "وەک پسپۆڕێکی چارەسەری دەروونی، کە چارەسەری خاوەن مەیلی هاوڕەگەزبازی دەکەم، هەست بە ترس و بیمێکی گەورە دەکەم، کاتێک دەبینم بزووتنەوەی هاوڕەگەزبازان بڕوایان بە جیهان هێناوە، کە کەسی هاوڕەگەزباز دۆخێکی تایبەتی هەیە و پێویستی بە تێگەیشتنێکی تایبەت هەیە! بۆ ئەم کارەیش پسپۆڕانی پزیشکی دەروونی ڕۆڵێکی گەورەیان تێدا بینیوە".[2]

دکتۆر (سام جی ماکفارلاند Sam G. McFarland) لە وتارێکدا، کە لە پێگەی کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ پزیشکیی دەروونی بڵاوی کردووەتەوە، نووسیویەتی: (زانستی دەروونناسی یاریدەدەر بوو، تا کۆمەڵگە هاوڕەگەزبازی قەبووڵ بکات).[3]

---

[1] أوسم وصفي: شفاء الحب: ص (٣٨-٤٠) و ص (٥٢-٥٧)

[2] جوزيف نيكولوسي: الصدمة النفسية كركن أساس عند الرجال مثليي الميول، من: رحلة رجت ت. شهاب الدين الهواري وآدم رمزي، ص ٩.

[3] How psychology has helped society accept homosexuality: https://shortur1.at/bgiJT

## ڕەتکردنەوەی هەر هەوڵێک بۆ چارەسەر:

(ئەوەی لەم ڕۆژگـارەدا حـوکم دەکـات زانسـت نیـیە، بەڵکـو ڕاسـتڕەوی سیاسـییە). خـاوەنی ئەم وشـانە (نیکـۆلاس کەمینگـز Nicholas Cummings)ـە، کە سەرۆکی بەڕێوەبردنی کـۆمەڵەی ئەمریکی بوو بۆ پزیشکیی دەروونی لە سـاڵی ١٩٧٩دا. قسـەکانی وەک وەڵامێـک بـوو بـۆ ڕەتکـردنەوەی بەردەوامـی پزیشـکە دەروونناسەکان، کە گوایە کەسانی خاوەن مەیـلی هاوڕەگەزبـازی ئەگەری چاکبوونەوەیـان نیـیە و وەک (ئـارەزوویەکی سروشـتی) سەیری دەکەن، کە پێویستی بە چارەسەرکردن نییە.[١]

هەر دەربـــارەی چارەســـەرە سروشـــتییەکان و هەوڵە چارەسـەرییەکان بـۆ ئـارەزووە هاوڕەگەزبازییەکـان، دکتـۆر نیـل وایتهێد لە کتێبەکەیدا قسەگەلێکی نزیک لە قسـەکانی نیکـۆلاس کـامینگەری کـردوون، کە دەڵێـت: "ئیـتر پسـپۆڕانی تەندروسـتی عەقڵ لە خۆرئاوا لە توانایاندا نییە (چارەسـەرێکی چاکسـازی) بـۆ ئەو کەسانە پێشکەش بکەن، کە مەیل و ئارەزووی لادەریان هەیە،

[١] Political Correctness Rules, Not Science: https://shortur1.at/opUXZ

چــونکە ملکەچــی سیاســەتگەلێکن لەســەریان فەرز دەکــات بە سروشــتە سێکســییەکەیان ڕازی بــن، تەنــانەت ئەگەر ڕیــزپەڕ و ناپەسەندیش بێت".(١)

(1) NE AND BK WHITEHEAD, My Genes Made Me Do It, Sixth (revised) edition 2020, p6

## توێژینەوەی ساختە و ناتەواو:

زۆرینەی توێژینەوەکانی بواری هاوڕەگەزبازی تەنیا جەختیان لە سەلماندنی ئەوە کردووەتەوە، کە ئارەزووە هاوڕەگەزبازییەکان سروشتیین و زۆربەی سەرپەرشتیارانی ئەو توێژینەوانە، هاوڕەگەزبازن و توێژینەوەکانیان لایەنگیری و ئارەزووی تایبەتیان پێوە دیارە و دوورن لە بابەتییەت و ڕوون و ڕاشکاوییەوە.

یەکێک لەو توێژینەوانە ئەوەیە، کە دکتۆر (سیمۆن لێڤای Simon LeVay) قسەی لەسەر کردووە، کە گوایە کۆبوونەوەی دەمارەخانەکان لە لای (پیاوانی هاوڕەگەزباز) دوو ئەوەندەی قەبارەکەیەتی لە لای (پیاوانی تر)، هەردوو دەستەواژەکەمان بۆ ئەوە خستوونەتە نێو دوو کەوانەوە، چونکە دیاریکردنی مەیلە سێکسییەکانی توێژینەوەکە قورسە؛ لەبەر ئەوەی ئەو نموونانە لە چەند پیاوێکی مردوو وەرگیراون. هەروەها پەیوەستکردنی ئەم دۆزینەوەیە و هاوڕەگەزبازی (یان لە نێوان گۆڕانکارییەکی جەستەیی و ڕەفتارێکی دیاریکراودا) تەنیا ڕێکەوتێکە، تا لە ڕێی چەندین توێژینەوەیەکی باوەڕپێکراوەوە یەکلا نەکرێتەوە، بەڵام هەرگیز ئەوە ڕوویـنەدا! ئەوەی ڕوویدا ئەوە بوو، کە ڕاگەیاندنی ملکەچی لۆبیی هاوڕەگەزبازان، ئەو توێژینەوە نەسەلمێنراو و نادڵنیایانە، کە لەسەر چەند نموونەیەکی زۆر کەم ئەنجامدراون،

دەکەنە ناونیشـــانی ســـەرنجڕاکێش بـــۆ ڕۆژنـــامە و هەواڵەکـــان. هەروەهـــا زۆرێـــک لەو تـــوێژینەوانە بـــۆ مەرامـــی ئەجێنـــدای بـزووتنەوەی هاوڕەگەزبـازی ئەنجـام دەدرێـن و توێژەرەکـانیش بە دوای هەر فاکتەرێکی جەستەیی هاوبەشەوەن لە نێوان پیـاو و ژنە هاوڕەگەزبازەکاندا، کە لە خزمەت مەرامەکانیانـدا بێـت، بێگومـان شتێکیش هەر دەدۆزنەوە.

هەمـــــوو ئەو کارانەیـــــان لەپێنـــــاو ســـــەلماندنی ئەوەدایە، کە هاوڕەگەزبازی گۆڕانکارییەکی سروشتیی جەستەییە.[1]

لەیەکێـک لە وتارەکانیـدا، پرۆفیسـۆر (ڕۆبێـرت ساپۆلسـکی Robert Sapolsky) مامۆستای بایۆلۆجیا لە زانکـۆی سـتانفۆرد، بـاس لەو ڕێـگەیە دەکـات، کە بەهـۆیەوە تـوێژینەوەکەی دکتـۆر سیمۆن بەلاڕێدا براوە.

ساپۆلسکی لە هـاوڕێکەیەوە، کە وەک نووسـەری زانسـتی لە گۆڤارەکەدا کار دەکات و ئەرکی بڵاوکردنەوەی توێژینەوەکەی پێ سپێردراوە، باس لەوە دەکات گۆڤارەکە بەئەنقەست بڵاوکـردنەوەی توێژینەوەکەی دواخستووە بۆ پێش هەڵبژاردنەکـانی سـاڵی ١٩٩٢، کە لە نێوان بیل کلینتـۆن و جـۆرج بۆشـی باوکـدا بـوو، چـونکە – بەپێـی قســەی سەرنووســەرەکە – دەیـانزانی هەرایەکـی گەورە

---

[1] أوسم وصفي: شفاء الحب: ل٤٣

دەنێتەوە.

دکتۆر ساپۆلسکی ئەو سیاسەتەی توێژینەوەکەی تێدا بڵاوکراوەتەوە بە (نادروست و بێزارکەر) ناودەبات و بەپێی قسەکەی: (توێژینەوەیەکی جوانە، بەڵام زانستی نییە!).[1]

شایانی باسە دکتۆر سیمۆن لیڤی خۆی هاوڕەگەزبازە، کە دوات[redacted] لە لێدوانێکیدا بۆ گۆڤاری (Discovery) نکوولی لەوە د[redacted] توێژینەوەکەی ئەوە بسەلمێنێت، کە هاوڕەگەزبازی [redacted]ی جینێکەوە، یان گۆڕانی بۆماوەییەوە پەیدا ببێت[2]، [redacted]گەیاندن ئاوڕ لەم لێدوانە ناداتەوە و تەنیا هەواڵە ساختە[redacted]بەستراوەکە بڵاودەکاتەوە.

لە ساڵی ٢٠١٥دا، تیمێک لە توێ[redacted] زانکۆی کالیفۆرنیا ڕایانگەیاند چەند نیشانەیەکی جیا[redacted]جینییان دۆزیوەتەوە، کە ڕۆڵی ڕاستەوخۆیان لە ئارەزو[redacted]سییەکانی هاوڕەگەزبازاندا هەیە، تا دوای ئەوە گۆڤ[redacted](Nature)ی بەناوبانگ بەبێ لێکۆڵینەوە و دڵنیا[redacted]ە، هەواڵەکەی بڵاوکردەوە و چەندین پێگەی ئەلیکترۆن[redacted]وای کەوتن!

هەواڵەکە[redacted] بڵاوبووەوە، بەڵام ئەوەی چاوەڕواننەکراو بوو،

---

(1) Human Sexual Behavior: https://youtu.be/LOY3QH_jOtE
(2) Sex and the Brain: https://shortur1.at/elmuv

ئەوە بوو، کە توێژینەوەکە لە ڕووی زانستییەوە درووست نەبوو و لەگەڵ پێوەرە پتەوەکانی توێژینەوەی زانستیدا یەکانگیر نەبوو؛ زۆر توێژەر گومانیان لە دەرئەنجامەکانی هەبوو، وەک نووسەری بواری زانستی (ئێد یۆنگ ED YONG)ی بەریتانی، کە چەند هەڵەیەکی تێدا دۆزییەوە و ئەوەی ئاشکرا کرد، کە تیمی توێژینەوەکە چەند تاقیکردنەوەیەکیان دوورخستووەتەوە و ئەوانەیشی، کە لەگەڵ لۆگاریتمەکانی توێژینەوەکەدا هاتوونەتەوە؛ هەڵیانبژاردوون، ئەو پێوەرانەی، کە پێشوەختە لە لایەن تیمی توێژەرەوە دانرابوون.[١]

دوای پێداچوونەوە و وردبینی بەردەوام لە لایەن توێژەر و نووسەرە زانستییەکانەوە، مامۆستای زانستی بۆماوەزانی (جۆن گریلی John Greally) ڕەخنەی لە توێژینەوەکە گرت و ڕەخنەکەی سەرۆکی تیمی توێژەرانی هێنایە دەنگ، کە خۆیشی سەرپەرشتیاری توێژینەوەکە بوو و دانی بەوەدا نا، کە توێژینەوەکە لە ڕووی زانستی و ئامارەوە کەموکوڕیی هەیە[٢]، بەڵام ئەمە دوای شەپۆلێکی گەورەی پیاهەڵدان و بڵاوکردنەوەی توێژینەوەکە لە گۆڤار و دەزگاکانی ڕاگەیاندن هات.

---

[1] No, Scientists Have Not Found the 'Gay Gene': https://shortur1.at/eqTW6

[2] Vizbang: https://shortur1.at/jprSV

چەندین ئامار و توێژینەوە هەوڵیان دەدا - بەتایبەت لە ویلایەتە یەکگرتووەکان - وێنەیەک بۆ ڕەفتاری سێکسی بکێشن، توێژینەوەکانی (ماستەر و جۆنسۆن William H. Masters Virginia E. Johnson)، هەروەها توێژینەوە بەناوبانگەکە، کە توێژەر و پزیشکی ئەمریکی (ئەلفرێد کینزی Alfred Kinse) لە ساڵی ١٩٤٨دا بڵاوی کردەوە و گوایە ڕێژەی هاوڕەگەزبازانی بە نزیکەی ١٠%ی کۆمەڵگە مەزەندە کردووە، لەگەڵ توێژینەوەکەی کینزیدا ئەفسانەی (یەک لە دە) پەیدابوو، بەو واتایەی ١٠%ی دانیشتوان بە سروشتی خۆیان هاوڕەگەزبازن! بەڵام زۆر کەس تانە لە ڕاستگۆیی ئەو توێژینەوەیە و وردی و زانستیبوونی دەدەن.

ئەوەی کینزی تۆماری کردووە ئەوەیە، کە ٣٧%ی پیاوانی نموونەی توێژینەوەکەی لانیکەم جارێک سێکسیان لەگەڵ نێرێکی تردا کردووە (بە سەردەمی هەرزەکارییشەوە). هەروەها کینزی ئەوەیشی تۆمار کردووە، کە ١٠%ی ئەو نێرانە (واتا لەو کۆمەڵەیەی بەدرێژایی ژیانیان لانیکەم یەک جار هاوڕەگەزبازییان کردووە) پەیوەندییەکەیان لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیاندا بۆ ماوەی نزیکەی سێ ساڵ بووە لە هەر قۆناغێکی ژیانیاندا، لە شانزە ساڵییەوە تا پەنجا ساڵی.

بزووتنەوەی هاوڕەگەزبازان ئەمەیان وەرگرت و کردیان بە

بابەتێکی گەرم بۆ برەودان بە هاوڕەگەزبازی، گوایە ١٠%ی کۆمەڵگە هاوڕەگەزبازە و بەمەیش جەخت لەوە بکەنەوە، کە هاوڕەگەزبازی هاوشێوەی ڕەنگی چاوەکان گۆڕانێکی سروشتییە.[١]

سەرباری ئەوە، ئەو ڕێگەیەی توێژینەوەکە لە ڕێیەوە گەیشتووەتە دەرئەنجامەکان؛ ورد و زانستی و تەکنیکی نییە، ئەمە بەپێی قسەی دکتۆر وایتهێد لە کتێبەکەیدا، کە لە باشترین لێکۆڵەرانی ئامار لە جیهاندا وەریگرتووە، ئەوانەی (هاوڕان لەسەر ئەوەی ڕێکارەکانی کینزی و تیمەکەی ژمارە و ڕێژەی هاوڕەگەزبازانیان دەستکاری کردووە و زیادیان کردووە!)

(پۆڵ ڕۆبینسۆن Paul Robinson)، کە مێژوونووسە و یەکێکە لە نووسەرانی ژیاننامەی کینزی، دەڵێت: "کینزی گرنگییەکی تایبەتی بە خووی نهێنی و هاوڕەگەزبازی داوە، هەردووکیشیان هۆکار بوون بۆ گۆشەگیربوونی؛ هەروەها ئەجێندای ئایدۆلۆجییشی هەبووە، هەروەک چۆن بڕوای وا بوو، کە سێکسی نموونەیی دەبێت بەپێی نموونە و پێوەرەکانی هاوڕەگەزبازی بێت".

---

[١] أوسم وصفي، شفاء الحب، ص ٢٠-٢١

شـــایانی باســـەکینزی خـــۆی دوانە مەیـــلی سێکســـی بـــووە[1] Bisexual، واتە لەگەڵ هەردوو ڕەگەزدا سێکسی کردووە.

لەم ڕۆژگـــارەدا زانســـت بە سیاســـی دەکرێـــت و بـــۆ خـــزمەت و بەرژەوەنـدی و ئەجێنـدای سیاسـی و بەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدی و خۆشەویسـتیی کـۆمەڵ و لـۆبیی خـاوەن هەژمـوون و دەسـەڵات بەسەر ڕاگەیاندن و ئابووری و زانکۆکاندا بەکاردەهێنرێت. ئەوەتـا لە ساڵی ٢٠٠٨دا فیلمی بەڵگەنامەیی: دەرکراوەکـان (المطـرودون): (زیرەکـی ڕێـگە پێـنەدراوە Expelled No Intelligence Allowed)، کە بـــریتییە لە دیـــداری ئەو زانـــا و ئەکـــادیمی و ڕۆژنامەوانـــانەی لە دامەزراوە زانســـتی و ئەکادیمییەکـــان و ناوەندەکانی توێژینەوە و بڵاوکراوەکاندا کاریان کـردووە، ڕاسـتیی بڵاوبـوونەوەی تیـرۆری فیکـری و هەژمـوونی لۆبییەکـان بەسـەر بڕیارەکـانی کـۆمەڵە زانسـتییەکان و ناوەنـدەکانی تـوێژینەوە و بڵاوکراوەکاندا ئاشکرا دەکات.

[1] My genes made me do it, Chapter: 2, p:28

## کێشەکە لەکوێدایە؟

توێژینەوەکان پەیوەندیی ڕاستەوخۆی نێوان جینات و ئـارەزووە هاوڕەگەزبازییەکـان ناسـەلمێنن، کەچـی ڕاگەیانـدن توێژینەوەکـان ساختە دەکات و دەرئەنجامی ناڕاستەقینە نیشان دەدات و ژمـارە و داتـای هەوایـی دەخـاتەڕوو، لە بەرانـبەردا هۆکـارە کـۆمەڵایەتییە کردەییەکـان، کە کاریگەرییـان بەسـەر هاوڕەگەزبـازانەوە هەیە؛ پشتگوێ دەخرێن، ڕەفتاری ئاژەڵان دەکرێـت بەڵـگە بـۆ سـەلماندنی بۆچوونە تایبەتییەکان!

ئەوان دەڵـێن ئیـتر چـی مـاوە، تـا بـڕوا بە مـرۆڤ بهێنێـت، کە هاوڕەگەزبـازی ڕەفتـارێکی ئـازادانەی خـۆیەتی، تەنـانەت ئەگەر چەندین هۆکاریش هەبـن، کە کاریگەرییـان بەسـەر بڕیـارەکەیەوە هەبێت.

هەروەها پێویستە مرۆڤ ئەوە بزانێت، کە (جینات) بەتەنیا بەس نییە بۆ لادانی بەرپرسیارییەت لەسەر هاوەڵانی پیدۆفیلیا..

تـاک بەرپرسـە لە کـردەوە و ڕەفتارەکـانی و بەرپرسـیارە لە جڵەوگیریی خود و ڕەفتار و ڕازەکانی دەروونی، هەروەها لێپرسراوە بەرانـبەر بە کـۆمەڵگە و بەر لە هەمـوو ئەمـانەیش لێپـرسراوە

بەرانبەر بەوەی ئاخۆ کێ ڕاست و هەڵەی بۆ دیاری دەکات، پەروەردگار فەرمووویەتی: ﴿ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ۝١٤ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ۝١٥ ﴾ (القيامة: ١٤ - ١٥) واتە: "بەڵکو ئادەمیزاد خۆی بەڵگەیە لەسەر خۆی، کە چیی کردووە و چیی نەکردووە. با هەرچی بڕ و بیانوویشی هەیە هەمووی بهێنێتەوە".

بڵاوبوونەوەی هاوڕەگەزبازی نیشانەیەکە لەنێو چەندین نیشانەی کۆمەڵگەیەکی نەخۆش، کە بەکاربردن و خۆشگوزەرانی تەنگیان پێهەڵچنیوە و لە پرسیارە گەورەکان غافڵیان کردووە و بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی تەندووستی لە بیر بردووەتەوە و لە لێپرسینەوە لە واقیع و بیرۆکەکانی و کاریگەری بەسەر ئایندە و مانەوەیدا لایداوە؛ بەمەیش کۆمەڵگەیەک هاتۆتە کایەوە، کە گرفتە دەروونییەکان تێیدا بوونەتە کردەوەی ئازادانە و نیشانەکانی لاوازیی کۆمەڵایەتی گۆڕاون بۆ ئازادیی تاکەکەسی.

لێرەدا بڕاردەکە لەدەستی خۆماندایە، ئاخۆ ئایندەمان لە واقیعێکی ناهەموار، کە زادەی کردەوەکانی خۆمانە ڕزگار دەکەین، یان سەرسامیمان بە هەژموونی زۆرینە کاریگەریمان لەسەر دادەنێت و دوای چەند ساڵێک خۆمان لە دۆخێکدا دەبینینەوە، کە بە چەندین بیرۆکە و پەتا و هۆکار و ئامرازی کارەساتبار دەورەدراوین؟!

# جینەکان و هاوڕەگەزبازیی..
# جینەکانم ناچار بەم کارەیان کردم!

## ئایا ئێمە بەرپرسین لە بەرامبەر مەیلە سێکسییەکانماندا؟!

لە دوو دەیەی دواییــدا زۆر قســە لەســەر ئەوە دەکرێــت گــوایە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکـان گەیشــتوونەتە ئەو دەرئەنجـامەی، کە (جین و هۆرمۆن) بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەرپرسن لە پێکهێنــانی مەیلە هاوڕەگەزبازییەکان.

ئەم گریمانەیە لەو جۆرە ژینگانەدا بـڵاوە و لە زیادبوونـدایە، کە بەرگری لە بـزووتنەوەی هاوڕەگەزبـازی دەکەن و بانگەشـەی ئەوە دەکەن – هەروەک دکتـۆر (أوســم وصــفي) لە کتێـبەکەی (شــفاء الحب)دا وەسفیان دەکات –، کە جیـاوازیی نێـوان هاوڕەگەزبـاز و خوازیارانی ڕەگەزی بەرانبەر وەک جیاوازی نێوان ڕەش و سپی و پیاو و ژن و کەسانی ڕاستە و چەپلەر وایە.

ئەمە واتا کەسی هاوڕەگەزباز ناچـارە و بە ئـارەزوو و ئـازادیی خۆی ئەوەی هەڵنەبژاردووە و دەسەڵاتی بەسەردا نیـیە و ناتوانێـت خۆی لێ ڕزگار بکات.

لە تەوەرەکانی دواتردا ئەم گریمانەیە دەخەینە سەر مێزی ڕەخنەگرتن و شیکارکردن.

ئێستا، بەر لە دەستپێکردن، با بزانین زانست لەبارەی کاریگەریی جینەکان بەسەر ڕەفتارەکانی مرۆڤەوە چی دەڵێت؟

## جینەکان و ڕەفتاری مرۆڤ:

مامۆستای لێکۆڵینەوەی خێزانی لە زانکۆی نبراسکا، (دۆگلاس ئابۆت Douglas A. Abbott) لە توێژینەوەکەیدا دەڵێت: "زۆر کەس وا دەزانن جینەکان بەرپرسیارن لە ڕەفتاری دەروونیی ئاوێتەدا، بەڵام لەڕاستیدا پرسەکە بەم جۆرە نییە.

لە زۆربەی بارودۆخەکاندا، ڕەفتار بەرهەمی کارلێکی جین لەگەڵ هۆکارە ژینگەییەکانە. کاتێک لە سەردێڕی ڕۆژنامەکاندا دەخوێنینەوە کە: (جینی X هۆکارە بۆ ڕەفتاری X)، ئەمە زیادەڕەویکردنێکی گەورەیە و جەماوەر بڕوای پێ دەکەن، لە کاتێکدا جینەکان ڕاستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر ڕەفتارەکان نییە، بەڵکو جینەکان کۆد بۆ پرۆتینەکان دروست دەکەن، کە دواتر لە ڕێی زنجیرەیەکی دوورودرێژی کرداری کیمۆ/ زیندەییەکانەوە بڕێک کاریگەری لەسەر ڕەفتار دادەنێن؛ هەرچی بازدانە لە جینی X ـەوە بۆ ڕەفتاری Y، ئەوە کردارێکی ئاوێتە و زۆر ئاڵۆزە. بەم جۆرە، تاقە جینێک لە توانایدا نییە، کە ڕەفتارێکی دیاریکراو دیاری بکات. ڕەفتارەکان سیفەتی ئاڵۆزن و چەندین جینیان لەخۆگرتوون و بەکۆمەڵێک هۆکاری جۆراوجۆری تر کاریگەر دەبن.

لە ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییەکاندا ئەم ڕاستییە دەشاردرێتەوە و

ڕەواج بە دۆزینەوە زانستییەکان دەدرێت لە بواری فرمانی جینەکاندا، کە بەداخەوە سەریان لە جەماوەر شێواندووە ".[١]

لە هەمان بواردا، ژنە زانای کیمیای زیندەیی (ڕۆس هەبەرد Ruth Hubbard) لە کتێبەکەیدا (تەقاندنەوەی ئەفسانەی جینەکان Exploding the Gene Myth)دا دەڵێت: "زۆر کەس - ی ناهۆشیار - دیدێکی سادەیان هەیە دەربارەی زانستی بۆماوەزانیی ڕەفتاری، وا دەزانن تاقە جینێک کاریگەریی بەسەر ڕەفتارێکی دیاریکراوەوە هەیە و سنوورداری دەکات، بەڵام جینەکان وەک بزوێنەری بووکەڵەی ناخیان کار ناکەن، بەڵکو گوزارشتن لە تەنی کیمیایی، کە پرۆتین بەرهەم دەهێنن؛ بەمەیش بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاریگەرییان بەسەر ڕەفتارەوە هەیە. جینەکان چارەنووسی مرۆڤ دیاری ناکەن! ئەمە سادەکردنەوەیەکی لەڕادەبەدەرە، کە بڵێین هەر جینێک جینی سیفەت بێت، واتە بەرپرسە لە سیفەتی ڕەفتارێک، چونکە هەر جینێک بەسادەیی پرۆتینێک سنووردار دەکات، کە بەشدارە لە کرداری کارلێکی جینی ژینگەیی؛ بۆیە هیچ کەسێک ناتوانێت لە ڕێی بەکارهێنانی جینەکانەوە پەی بە جۆر و شێوەی ڕەفتارەکان ببات".[٢]

---

[1] Myths and Misconceptions, About Behavioral Genetics and Homosexuality, Douglas A. Abbott.

[2] How genes work. (2007). Genetic Home Reference, A Handbook on How Genes Work. Retrieves online July 6, 2007m from: https://bit.1y/3dG04EI

←

کەواتە.. هەروەک ڕوونمان کردەوە، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان جینەکان و ڕەفتارەکانی مرۆڤدا نییە و ڕۆڵی جینەکان تەنیا بەشداریکردنە لە درووستبوونی ڕەفتاردا، نەک سنووردارکردنی.

ئێستایش با پرسیارێکی دیاریکراو بکەین: ئایا دەکرێت ڕۆژێک لە ڕۆژان جینێکی دیاریکراو بدۆزرێتەوە، کە هاوڕەگەزبازی وەک سیفەتێکی ڕەفتاری، کە چاوگەکەی جین بێت و مرۆڤ دەسەڵاتی بەسەردا نەبێت؟ یان ئەگەر هاتو جینێک دۆزرایەوە، کە بەرپرس بێت لە ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی، ئایا ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت، کە ڕەفتار تەنیا بەهۆی جینەوە درووست دەبێت و کارا دەبێت و ناتوانرێت هیچ کات خۆی لێ ڕزگار بکرێت؟!

(پزیشکانی دامەزراوەی ئەمریکی بۆ چارەسەرکردنی ئالوودەیی American Addiction Centers)، کە دامەزراوەیەکە چارەسەر بۆ ئالوودەبوون بە ماددەی هۆشبەر و مەیخۆری و هەژانە عەقڵییەکان فەراهەم دەکات، پێیان دەڵێت بوونی جینێک بە واتای ئەوە نایەت، کە مرۆڤ ناچار بکات کارێکی دیاریکراو بەناچاری ئەنجام بدات، چونکە بوونی جینەکە بە واتای ئەوە دێت ئەم کەسە،

---

Hubbardm R., & Wald, E. (1999). Exploding the gene myth. Boston, MA: Beacon.

یـــان ئەو کەســـە زەمینەیەکـــی شـــیاوی هەیە بـــۆ تووشـــبوون بە نەخۆشیی شەکرە، یان شێرپەنجەی سییەکان، یان ئـالوودە ببێـت بە ماددە کحولییەکانەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێک بە واتای ئەوە نایەت، کە ناچاری بکات ئالوودە بێت.(١)

دوای ئاشنابوون بە کاریگەریی جینەکـان بەسـەر ڕەفتارەکـانی مـرۆڤ و پەیوەنـدییان بە داتاشـینی ڕەفتارەکـانەوە، دەچیـنە سـەر قسەکردن لەسەر جینەکان و ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی.

(1) Genetics and Addiction: Is Alcoholism Hereditary or Genetic: https://shortur1.at/cirTZ

## جینەکان و هاوڕەگەزبازی:

لە مانگی ئابی ساڵی ٢٠١٩دا گۆڤاری (Science)ی ئەمریکی، کە گرنگــــی دەدات بە بڵاوکـــــردنەوەی تـــــوێژینەوە زانســــتییە ئەکادیمییەکان و تا ئێستا گەورەترین و وردترین توێژینەوەن لەم بوارەدا، نکوولی لەوە دەکات، کە هیچ جینێکی بەرپرس هەبێت لە درووستبوونی (مەیل و ئارەزووە هاوڕەگەزبازییەکان).

تــوێژەرە سەرپەرشــتیارەکانی تــوێژینەوەکە، کە هەســتاون بە پشــکنین بــۆ جینــۆمی مرۆیــی بــۆ نــزیکەی ٥٠٠'٠٠٠ کەس، دەرئەنجــامەکەی بەم جــۆرە بــووە: تەنــانەت تــاکە جینێــک نیــیە کــاریگەری گەورەی لەســەر ڕەفتــارە سێکســییەکان هەبێــت و ڕەفتــاری سێکســی هاوڕەگەزبــازانە لە ڕووی جینیــیەوە شــیاوی (پەیپێــبردن و پێشــبینیکردن) نیــیە و هاوڕەگەزبــازی وەک هەر ڕەفتارێکی تر چەنـد هۆکارێـک هەن، کە کاریگەرییـان لەسـەری هەیە.

توێژەران بەشداربوانی توێژینەوەکەیان دابەش کـردووە بـۆ دوو کـــۆمەڵە: کـــۆمەڵەی یەکەم ئەوانەی، کە سێکســـــیان لەگەڵ هاوڕەگەزی خۆیاندا ئەنجام داوە و کـۆمەڵەی دووەم ئەوانەی، کە ئەم کارەیان نەکردووە. پاشان توێژەران دوو شیکاری جیایان ئەنجام داوە؛ لە شیکاری یەکەمدا: هەڵسەنگاندنیان بۆ زیاتر لە ملیۆنێـک

زیـادبوونی شـێوەی نیوکلۆتایـد Nucleotide (نیوکلیۆتایـدەکان: یەکەی تاکن لە ترشی ناوکی پێکهاتوون) کـرد، پاشـان پشـکنینیان بـۆ ئەوە کـردووە، کە ئـاخۆ ئەو کەسـانەی زۆرتـرین زیـادبوونی شـێوەی نیوکلیۆتایـدیان هەیە و لەگەڵ کەسـانی تـردا ژمارەکەیـان هاوشێوەیە هەمان ڕەفتاری سێکسییان هەیە؟ زانایان گەیشـتنە ئەو دەرئەنجـامەی، کە زانسـتی بۆمـاوەزانی دەتوانێـت ٨-٢٥%ی جیاوازی لە ڕەفتاری سێکسییدا بەدی بکات.[1]

لە کتێبەکەیدا (جینەکـانم ناچاریـان کـردم NE Whirehead)، کە وەک تـوێژەرێکی زانسـتیی لە نیوزیلەنـدا کـار دەکـات و دکتۆرای لە کیمیای زیندەییدا هەیە، بـاس لەوە دەکـات لەمیـانەی تێگەیشتنی لە بنچینەی جینەکان و فرمانەکانیـان، دەتـوانین بڵێـین جینەکان نـاتوانن ڕەفتـاری هاوڕەگەزبـازانە؛ یـان هەر ڕەفتـارێکی تـری مـرۆڤ ئاراسـتە بـکەن، ئەمە جـگە لەوەی، تـا ئێسـتا هـیچ ڕەفتـارێکی مرۆیـی نەدۆزراوەتەوە، کە لە ڕێـی جینەکـانەوە سنووردار کرابێت؛ بەڵکو ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی زادەی بـارودۆخ و ژینگەی کۆمەڵایەتییە و لە ڕێی هیچ پێکهاتەیەکی بۆماوەییەوە بەرهەم نایەت.[2]

---

(1) No 'gay gene': Massive study homes in on genetic basis of human sexulity: https://shortur1.at/bZ015

(2) NE AND BK WHITEHEAD, My Genes Made Me Do It, Sixth (revised) edition 2020. Chapter 1, 13

هەرچی دەربارەی ڕۆڵی هۆرمۆنەکانە، دکتۆر نیل دەڵێت: "بیرۆکە سەرنجڕاکێشەکە ئەوەیە، کە دەڵێت هۆرمۆنەکان بەر لە لەدایکبوون ئاراستەی سێکسیی مرۆڤ دیاری دەکەن! کەچی سەلمێنرا کاریگەرییەکی زۆر کەمیان هەیە. ئەمە سەرباری ئەوەی، کە هیچ بەڵگەیەکی قایلکەر نییە لەسەر ئەوەی هۆرمۆنەکان بەر لە لەدایکبوونی مرۆڤ کاریگەرییان لەسەر ئاراستەی سێکسیی مرۆڤ هەبێت".[1]

مامۆستا (دۆگلاس ئابۆت Douglas A. Abbott) بۆچوونێکی هەیە و لە توێژینەوەکەی پێشوودا، کە باسمان کرد، باسی کردووە و دەڵێت: "گەڕان بە دوای جینی هاوڕەگەزبازی گرفتێکی گەورەی تێدایە، ئەوەی، کە توێژینەوە جینییە/ ڕەفتارییەکان ( Behavioral Genetics) بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە ڕەفتاری مرۆڤیان سنووردار نەکردووە، وەک چۆن جینێکی دیاریکراو نەخۆشییەکی ئەندامی دیاریکراو سنووردار دەکات.

کەواتە بەپێی نوێترین توێژینەوەکان و وەک دووپاتکردنەوەی بۆچوونە پزیشکییەکان و دەرئەنجامی توێژینەوە زانستییەکانی پێشوو، بۆمان دەردەکەوێت، کە ڕۆڵی جینەکان بە ڕێژەی زۆرەوە ٢٥%ی پێکهێنانی ڕەفتاری هاوڕەگەزبازانە تێناپەڕێنێت، ئەوەی

(1) Ibid, Chapter 7, p:115

دەمێنێتەوە بەندە بە: ژینگە، پەروەردە، بـارودۆخی کـۆمەڵایەتی و دەوونــی و شــیاوی کەســی بــۆ پەرەســەندنی ڕەفتــارەکە، یــان ڕەتکـردنەوەی. لە تەوەرەکـانی دواتـردا لەبـارەی ئەو هۆکـارانەوە دەدوێین.

لێـرەدا پـوختەی ئەم باسـە لە سـێ یاسـای جەوهەریـدا کـورت دەکەینەوە:

- شتێک نییە بەناوی جین، یان هۆرمۆنی هاوڕەگەزبازی.
- جینەکان ڕەفتارەکانی مرۆڤ دیاری ناکەن، بەڵکو بەشدارن لە درووستبوونیاندا.
- کاریگەریی جینەکان لە نێوان ٨ - ٢٥%ی دارِشتنی مەیـلە هاوڕەگەزبازییەکاندایە.

## هاوڕەگەزبازی بەتەنیا نامێنێتەوە، پیدۆفیلیایش بەڕێوەیە:

با پرسیارێکی تری تایبەت بە جینەکان بکەین، بەڵام ئەمەیان پەیوەستە بە ئارەزووکردنی منداڵانەوە؛ گریمان توێژینەوەکان بوونی جینێکیان بۆ سەلماندین، کە پاڵنەرە بۆ ئارەزووکردنی منداڵان، ئایا لەسەرمانە بەئەنجامدانی سێکس لەگەڵ منداڵان ڕازی بین؟! بێین داوای دەرکردنی یاسا بکەین بۆ پاراستنی ئەو کەسانەی ئەو تاوانە ئەنجام دەدەن و ماف و ئازادییان پارێزراو بێت؟! هەموو ئەمانە بەهۆی بوونی جینێکەوە!

بەڵامپرسەکە تەنیا گریمانەیەک نییە، لە ئەمڕۆدا چەندین بزووتنەوە و ڕێکخراوی چالاکی ئەلیکترۆنی و لە واقیعیشدا هەن، کە داوای دەرکردنی یاسا بۆ ڕەوایەتیدان بە سێکسکردن دەکەن لەگەڵ منداڵاندا، بەناوبانگترینیان ڕێکخراوی (NAMBLA)، (ڕێکخراوی خۆشەویستی پیاو بۆ منداڵ لە ئەمریکای باکوور The North American Man/Boy Love Association)، کە پشتگیری لە پەیوەندییە سێکسییەکان دەکات، کە بە ڕەزامەندیی نێوان پیاو و منداڵە و داوا دەکات یاسا باوەکان بگۆڕدرێن و دووبارە تەمەنی ڕێپێدراو بۆ پەیوەندییە سێکسییەکان لە نێوان کەسانی تازەپێگەیشتوو و منداڵاندا دیاری بکرێتەوە. چەندین

کۆمەڵەی تریش هەن، وەک کۆمەڵەی ( Virtuous pedophiles organization) و کۆمەڵەی (Boywiki).

بەپێی هەندێ توێژینەوە، ئارەزووکردنی منداڵان (pedophilia) ڕەفتارێکی بۆماوەیی جینییە، کتومت وەک پاساوی هاوڕەگەزبازییەکەیان.[1]

ئایا دەکرێت پیدۆفیلیا مافێکی ڕەوا بێت، بەهۆی بوونی ئەم هۆکارە جینییەی، کە لە هەندێ کەسدا هەیە؟! پیدۆفیلیا لە هەموو یاساکانی جیهاندا تاوانە و دەستدرێژیکردنی سێکسی بۆ سەر منداڵ، تەنانەت ئەگەر ئارەزوومەندانەیش بێت نایاساییە، چونکە نەگەیشتووەتە تەمەنی یاسایی مافی بڕیاردان.

ئەمە واتای ئەوەیە، کە جینەکان پاساو نین بۆ ڕاستیی ڕەفتاری مرۆڤ و ئازادیی تاکەکەسی، هەروەها بەڵگەیش نین بۆ دانانی یاسا و ڕێسا و بە هیچ بڕوبیانوویەکەوە ناچەسپێنرێن. بەوپێیەی جینەکان بەرپرس نین لە ڕەفتاری مرۆڤ (هەروەک ڕوونمان کردەوە)، وەک چۆن بوونی شتێکی پەیوەست بە پیدۆفیلیا خاوەنەکەی لەدەست بەرپرسیارێتیی کۆمەڵایەتی و یاسایی ڕزگار ناکات، ئەمە بۆ زۆر کرداری تریش درووستە، کە ناتوانرێت بەرپرسیارێتییەکەی بەتەنیا بخرێتە ملی جیناتەوە.

[1] Is There A pedophilia Gene? https://bit.1y/3QxtW16

با ئالوودەبوون بە مادده هۆشبەرەکان وەک نموونە وەربگرین، کە سیفەتێکی ڕەفتارییە و بە ڕێژەیەکی زۆر بەشداری دەکات لە پێکهاتەی جینیدا و هەمان ڕێژەیش لە پێکهاتەی ژینگەییدایە، ئەمە بەپێی ئامارەکانی پەیانگای نەتەوەیی ئەمریکی بۆ ئالوودەبوون بە مادده کحولییەکان؛ هەروەها پزیشکی چارەسەرکاری دەروونی ئامۆژگاریی کەسی ئالوودەبوو دەکات لەو کارتێکەرە دەروونییانە دووربکەوێتەوە، کە دەبنە هۆی ئەنجامدانی ئەو ڕەفتارە و بەوە وازناهێنێت، کە پێی بڵێت دەکرێت جیناتی هاندەرتان هەبێت بۆ خواردنەوەی مادده کحولییەکان!

لێرەدا – جارێکی تر – دەبینین، کە کۆمەڵگە هیچ عەیبێک لەوەدا نابینێتەوە ڕەفتارێک ڕەت بکاتەوە کە پێکهاتەیەکی جینیی هەیە، چونکە بەرپرسیارێتیی کۆمەڵگەیی بەتەنیا لەسەر جینات نەوەستاوە.

باسمان لە ڕۆڵی جینەکان کرد لە پێکهێنانی ڕەفتاری مرۆییدا، هەروەها باسمان لە پەیوەندیی جینەکان بە هاوڕەگەزبازییەوە کرد، پاشانیش قسەمان لەسەر ڕەفتارەکان کرد بە پاساوی بوونی جینی ئاراستەکەر، ئێستایش ئیتر دەروازەیەکی تر دەکەینەوە بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکە.

## زانستی دەروونناسی و هاوڕەگەزبازی:

(سیگمۆند فرۆید Sigmund Freud) پێشەوای شیکاریی دەروونی وای دەبینێت، کە (هەڵەیە هاوڕەگەزبازی وەک کەموکورییەکی بایۆلۆجی تەماشا بکەین و گواستنەوەیشی لە خانەی سایکۆلۆجی (دەروونیی) و دانانی لە خانەی شیکاریی (بایۆلۆجی) بێهوودەیە و هیچ پاساوێکی بۆ نییە).[1] ئەم بۆچوونە لەگەڵ بۆچوونی زانای دەروونناس (کارل یۆنگ Carl Jung) و دکتۆر (ئەلفرێد ئەدلەر Alfred Adler)دا یەکانگیرە، کە بڕوایان وایە: هاوڕەگەزبازی زادەی کەموکورییەکە لە گەشەی دەروونداا.[2]

باسەکە تەنیا بەم شێوەیە نییە، بەڵکو فرۆید وای دەبینێت، کە چەسپاندنی غەریزەی سێکسی (لیبیدۆ)[3] لە قۆناغی ئۆدیبیدا (کە یەکێکە لە قۆناغەکانی گەشەکردنی سێکسی لە لای منداڵ لە

---

[1] فروید: ثلاث مباحث في نظرية الجنس، ت. جورج طرابيشي: ل١٩

[2] أوسم وصفي: شفاء الحب: ل٣٩

[3] لیبیدۆ libido وشەیەکی لاتینییە واتا: چێژوەرگرتن بە پشتبەستن بە ئارەزوویەکی هەستەکی. لەسایەی شیکاری دەروونییدا بریتییە لە وزەی دەروونی بۆ وزەی بنچینەیی دەروونی زیندەوەر. سەرنجی مەوسوعەی عەرەبی بدە https://shortur1.at/ANQ12

تەمەنێکی زوودا، ئەمە بە بۆچوونی فرۆید)، ئەگەر بە شێوازێکی ڕاست و درووست تێنەپەڕێت و منداڵەکە لەگەڵ دایکیدا نەبێت، ناسنامەی نێرینەیی بۆ درووست نابێت.[1]

لەبەرانبەر بۆچوونەکەی پێشوودا، شیکەرەوەی دەروونی (جاک لاکان Jacques Lacan) بۆچوونێکی هەیە و دەڵێت: "باوک ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە توشبوون بە ڕەفتاری هاوڕەگەزبازانە[2]"، ئەمەیش لە ڕێی پێگەکەی و ڕۆڵی لە پەیوەندی لەگەڵ دایکیدا و چۆنیەتییەکەی بۆ منداڵەکە.[3]

زانای دەروونناس (جۆزێف نیکۆلۆسی Joseph Nicolosi)یش وای دەبینێت، کە: (هاوڕەگەزبازی گوزارشتە لە هەوڵدان بۆ تیمارکردنی برینێکی بنچینەیی، کە بەهۆی شکست لە دەستکەوتنی ناسنامەی نێرینەیی پەیدابووە، ئەمەیش وای کردووە کەسی هاوڕەگەزباز ڕقی لە ناسنامەکەی بێت و لێی ڕابکات).[4]

---

[1] فروید: ثلاث مباحث في نظرية الجنس، ت. جورج طرابيشي: ل٢١

[2] لە کتێبەکەیدا (جینەکانم ناچاریان کردم)، دکتۆر (Neil Whitehead) باس لەوە دەکات، کە باوک و دایک ڕۆڵێکی گەورەیان هەیە لە گەشەکردنی ئارەزووە هاوڕەگەزبازییەکان لە لای منداڵ. بۆ زانیاریی زیاتر سەرنجی بەشی سێیەمی کتێبەکە بدە.

[3] عدنان حب الله: التحليل النفسي للرجولة والأنوثة: ص (١٣٤-١٣٦).

[4] جوزيف نيكولوسي: الصدمة النفسية كركن أساس عنج الرجال مثلي الميول، من: رحلة رجل ت. شهاب الدين الهواري وآدم رمزي: ص ١٠

بۆچوونی چارەسەرکارە پسپۆڕەکانی چارەسەری ڕەفتاری هاوڕەگەزبازانە لە دوای فرۆید، وەک (ڕیچارد کۆهین Richard Cohen)، لە یەکێک لە نەخۆشە چاکبووەوەکان لە هاوڕەگەزبازی بۆمان دەگێڕێتەوە، کە وتوویەتی: "هاوڕەگەزبازی پەیوەندی بە سێکسەوە نییە، بەڵکو لەبنەڕەتدا پەیوەستە بە ڕەتکردنەوە و جیابوونەوە لە دەروون و کەسانی تر و ناسنامەی جۆری کەسەکە خۆی".[1] کۆهین وای دەبینێت، کە ئەو وەک چارەسەرکەرێکی دەروونیی پیاو و ژن و هەرزەکارە هاوڕەگەزبازەکان بۆ چارەسەرکردنی ئارەزووە هاوڕەگەزبازییە نەخوازراوەکانیان، کە هاوڕەگەزبازی زادە و بەرهەمی چەندین هۆکارە، وەک بۆماوەیی و میزاج و برینە سۆزدارییەکانی هاوڕەگەزبازی و برینە سۆزدارییەکانی کەسانی تر و برینەکانی برایەتی/ داینامیکای خێزان و برینەکانی وێنەی خودی و دووچاربوونی بە دەستدرێژیی سێکسی و برینەکانی پەیوەندیدار بە کەسانی هاوتەمەن و برینەکانی کۆمەڵگە و چەندین هۆکاری تری وەک تەڵاق و بارودۆخە ژینگەیی و ئاینییەکان.[2]

پزیشکی ئەمریکی (جیفری ساتینۆڤەر Jeffrey Satinover) نموونەیەکی هەرەمیی داناوە بۆ دیاریکردنی هۆکارەکانی

[1] ریتشارد کوهین الآخر القريب، ت. شاب الدين الهواري ورؤوم بهاء الدين: ص ٦٩

[2] الآخر القريب، ريتشارد كوهين، ترجمة د. شهاب الدين الهواري، رؤوم بهاء الدين.

پەیدابوونی هاوڕەگەزبازی؛ یەکەمین هۆکار: ئامادەگیی بۆماوەیی و هۆرمۆنییە، پاشان کاریگەریی پەیوەندییەکان لەنێو خێزاندا، دواتر تێکەڵبوون لەگەڵ هاوتاکانیان لە هەمان ڕەگەز و ڕەگەزی بەرانبەردا، تا دەگاتە ئازاردانی دەروونی و کاریگەرییە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان و ئالوودەبوون و ڕاهاتن و لە لووتکەی هەرەمکەیشدا (هەڵبژاردنی ئازادانە).[(١)]

ئەمە دیدی پزیشکی دەروونی و چارەسەرکەرە دەروونییەکانە بۆ هاوڕەگەزبازی، تەنانەت بەڵگەی دەستنیشانکەر و ئاماری نەخۆشییە دەروونییەکانیش (DSM)، کە لە ساڵی ١٩٥٢ و لە لایەن کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ پزیشکیی دەروونی دەرچووە، هاوڕەگەزبازیی وەک (هەژاری سیکۆباتی) و (دژ بە کۆمەڵگە) وەسف کردووە، بەڵام دواتر لە ساڵی ١٩٦٨دا گۆڕییان بۆ پۆلێنی (لادانە سێکسییەکان).

ئەم گۆڕانکارییە گەورەیەیش لە ژێر فشاری لۆبی هاوڕەگەزبازیدا بوو، دواتریش لە ساڵی ١٩٧٣ هاوڕەگەزبازی بەتەواوەتی لە ڕێبەری دەستنیشانکەری پزیشکیی دەروونیدا سڕایەوە.[(٢)]

---

(١) جيفري ساتينوفر: الجنسية المثلية وتسييس الحقيقة، عن: أوسم وصفي: شفاء الحب: ٧٥

(٢) أوسم وصفي: شفاء الحب: ص ٣٤-٤٠

ئەم گۆڕانە زادەی هەوڵـی زانسـتی، یـان دۆزیـنەوە پزیشـکییە نوێیەکان نەبـوو، بەڵکـو زادەی فشـاری لـۆبیی هاوڕەگەزبـازی و مـافپەروەرە داکۆکیکارەکانیـان بـوو، کە تـا ئێسـتایش ڕۆڵێکـی گەورەیـان لە سـەپاندنی هاوڕەگەزبازیـدا هەیە بەسـەر کـۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا.

لە کتێبەکەیدا (جیناتم ناچاریان کـردم ئەنجـامی بـدەم)، دکتـۆر نیـڵ وایتهێـد بـاس لەوە دەکـات، کە کـۆمەڵەی ئەمریکـی بـۆ پزیشکیی دەروونی حوکمێکی پزیشکیی دەرکردووە، کە لە ڕێیەوە هاوڕەگەزبـازیی لە ڕێـبەری دەستنیشـانکردنی نەخۆشـییە دەروونییەکانـدا سـڕییەوە بە ڕەزامەنـدیی تەنیـا ٣٤%ی ئەنـدامەکانی، ئەمەیـش دوای چەنـد مانگێـک لە بێزارکـردن و ترسـاندن لە لایەن چـالاکوانە هاوڕەگەزبازەکـان، کە تـوێژینەوەی زانستییان پەک خست و بەڵگەنامەکانیان ساختەکرد و هەڕەشـەی جەسـتەییان لە پزیشـکە دەروونییەکـان کـرد. بـۆیە کـۆمەڵەکە ئایدۆلۆجیاکەی لە ڕێی نەخشەکێشان و پلانـدانانەوە چەسـپاند، بە هەمان ڕێکارەکانی تۆقاندن و چەوساندنەوەی هزری. ئەمە قسـە و وەسفی دکتۆر نیلە بۆ ڕووداوەکانی ئەوسا.[١]

[1] NE AND BK WHITEHEAD, My Genes Made Me Do It, Sixth (revised) edition 2020, Chapter 12, p:209

## ئاژەڵ و هاوڕەگەزبازی، لە نێوان کاری ئاژەڵ و ڕەفتاری مرۆڤدا:

هەندێ کەس بە پاساوی پێوانەکردنی ڕەفتاری مرۆڤ بە کاری ئاژەڵ، ڕەوایەتی بە هاوڕەگەزبازی دەدەن، دەڵێن وەک چۆن هاوڕەگەزبازی لە جیهانی ئاژەڵاندا هەیە، سروشتییە لەنێو مرۆڤەکانیشدا هەبێت! بەڵام جیاوازیی نێوان دوو ڕەفتارەکە لەوەدایە، کە ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی لە جیهانی ئاژەڵدا پاڵنەرەکەی ئارەزوو و مەیلی سێکسیی نییە وەک چۆن هاوڕەگەزبازان وەهان، بەڵکو بۆ چەند مەبەستێکی ترە، کە زانایانی ئاژەڵناسی باسی دەکەن.

دکتۆر (ئەنتۆنیۆ پاردۆ Antonio Pardo) مامۆستای ڕەوشتە زیندەییەکان لە زانکۆی (ناڤاری ئیسپانی) وەسفی ئەمە دەکات و دەڵێت: "وەک گەواهییەکی ورد، هاوڕەگەزبازی لەنێو ئاژەڵاندا بە ئامانجی مانەوە نییە، چونکە خواستی زاوزێ و زۆربوون بەردەوام بە ئاراستەی ڕەگەزی بەرانبەرە، بەم جۆرە هەرگیز هاوڕەگەزبازی بوونی نابێت. سەرباری ئەوەیش، کارلێکی هەندێک خواست و غەریزە، بەتایبەت غەریزەی هەژموون، دەکرێت ببێتە هۆی ئەنجامدانی ڕەفتارێک، کە وەک هاوڕەگەزبازیی خۆی دەنوێنێت، بەڵام ناکرێت بەسەر هەموو ئاژەڵاندا گشتاندنی بۆ بکرێت".

پاشان دەڵێت: "ڕەفتاری سێکسی لە مرۆڤدا زۆر ئاڵۆزترە وەك

لە ئاژەڵ، چونکە سەرەڕای ئەوەی دەکرێت ڕێنموونیهان بکات بۆ هەندێک لایەن لە مرۆڤدا، کەچی هەندێک ڕەگەز لە مرۆڤدا هەن و لە ئاژەڵدا نین. لێرەدا تەنیا باس لەوانە دەکەین، کە پەیوەندیدارن بە بابەتەکەوە، کە بریتییە لە هۆکارە سەرەکییەکە..

دەڵێین ڕەفتاری سێکسیی مرۆیی - وەک هەر ڕەفتارێکی تری - دەکرێت بابەتی بڕیاردان بێت، دەکرێت جێبەجێ بکرێت، یان لێی پەشیهان ببێتەوە، بەڵام ئەو بڕیارە لە توانای ئاژەڵدا نییە. بەم شێوەیە ئەم ڕەفتارە لە جیهانی ئاژەڵدا پاڵنەری غەریزەیی و بارودۆخی ژینگەیی هەیە، کەچی لە ڕەفتاری مرۆییدا لە دۆخێکی ناسەقامگیردایە لە نێوان مەیل - ئارەزوو - و بڕیارداندا.

پەروەردەی مرۆیی، وەک لە ئاژەڵانیشدا وایە، بەدیهاتنی دامەزراو لەسەر غەریزە نییە، بەڵکو گەشەدانە بە زیرەکی و سۆز، کە وا لە مرۆڤ دەکات بتوانێت ئازادانە بڕیار بدات و توانای ڕووبەڕووبوونەوەی مەیل و ئارەزووەکانی هەبێت، کاتێک قورسە بۆی بتوانێت کارێکی باش ئەنجام بدات.[١]

گریهان هاوڕەگەزبازی لە لای هەندێ لە ئاژەڵان هەیە، بە هەمان ئەو واتا باوەی مرۆڤەکان، ئایا دەکرێت ئەمە بکرێتە بەڵگەیەکی فیتری و سروشتیی هاوڕەگەزبازی لە لای مرۆڤ؟! زۆرێک لە

[1] Antonio Pardo, Aspectos medicos de la homosexualidad, publicado en la revista Nuestro Tiempo, Julio-Agoste de 1995, pp. 82-89.

زانایـان لەگەڵ ئەم بەڵگەهێنـانەوەیەدا نـین، دەڵـێن: ناگونجێـت غەریزە و ڕەفتـارە ئاژەڵییەکـان لەگەڵ مرۆڤـدا بەراورد بکـرێن، بە پاساوی ئەوەی هەرچی ئاژەڵ ئەنجامی دەدات کارێکی سروشتی و ئاساییە! بۆ نموونە: هەندێک لە ئاژەڵان - ی هەمـان پـۆل - یەکـتر دەخۆن، ئایا دەکرێت ئەم ڕەفتارە بگوازینەوە بۆ ڕەفتاری مرۆڤەکان و لەسەر لاشەی یەکتر بژین و گۆشتی یەکتر بخـۆن؟! بـۆ نمـوونە: هەندێک لە پشیلە گەورەکـان پشـیلە بچووکەکـان دەکـوژن، هەتـا ئەگەر بێچـووی خۆیشـیان بـن. ئەمە پـاڵنەرێکی غەریـزەییە و لە پشـیلەکاندا هەیە، هۆکارەکەیشـی بـوونی هەنـدێ گۆڕانکـاری سـایکۆلۆجی و ئەنـدامییە، ئایـا دەکرێـت ئەم ڕەفتـارە بـۆ مـرۆڤ بگوازینەوە، یان ئایا دەکرێت مرۆڤ هەمـان کـار ئەنجـام بـدات بە بیانووی ئەوەی ئاژەڵان ئەنجامی دەدەن؟!

هەنـدێ لە ڕەفتـارە سێکسـییە ئاژەڵییەکـانی تـریش بە هەمـان شێوەن، بۆ نموونە: هەندێ لە ئـاژەڵان لەگەڵ نزیکەکانیـان جـووت دەبـن، هەنـدێکیان دەسـتدرێژی ئەنجـام دەدەن و هەندێکیشـیان فرەجووتبـوون دەکەن. ئایـا دەکرێـت بڵێـین ئەمە فیترەتێکـی سرووشتییە و دەکرێت مـرۆڤ ئەنجامیـان بـدات، چـونکە ئـاژەڵان ئەنجامی دەدەن؟!

## ژینگەی کۆمەڵایەتی ڕێگەیەکە بۆ هاوڕەگەزبازی:

خواستی هاوڕەگەزبازی خواستێکی بۆماوەیی نییە، بەڵام دەکرێت لە ماوەی چەند ساڵێکدا وەک کاردانەوەیەک لە لایەن کەسەکەوە بۆ ڕووداوەکانی ژیان دەربکەوێت، هەروەک زۆربەی قەیران و ڕووداوەکانی تر، کە مرۆڤ پێیاندا تێدەپەڕێت.

نەبوونی باوک و دایک ڕۆڵێکی گەورەیان لە پەرەسەندنی مەیلە هاوڕەگەزییەکاندا هەیە، هەروەک یەکێک لە توێژینەوەکان باس لەوە دەکات، کە نەبوونی باوک (بە هۆکاری وازهێنان، یان مردن) ئاماژەیەکە بۆ ڕۆیشتنی منداڵ بەرەو هاوڕەگەزبازی بە ڕێژەی ١٨% زیاتر لە منداڵانی تر، کە لەگەڵ باوک و دایکیاندا دەژین.[1]

هەروەها ژینگە و پەیوەندییە خێزانییەکان زۆر گرنگ و هەستیارن لە تووشبوون بە درووستبوونی ڕەفتاری هاوڕەگەزبازانە، ئەوەتا هەردوو توێژەر (فریش و هڤید Frish & Hviid) لە ڕێی توێژینەوە لە هۆکارەکان، کە دەبنە هۆی هاوسەرگیری هاوڕەگەزبازە دانیمارکییەکان، لە نەبوونی باوک و دایکدا ئەگەرەکەیان بە نزیکەی ٢٠ %ی زیادکردووە.[2]

---

(1) Frish M., Hviid A. 2006, Childhood family coorelates of heterosexual and homosexual marriages: A National cohort study of two million Danes, Archives of Sexual Behaviour 35(5): 533-547

(2) NE AND BK WHITEHEAD, My Genes Made Me Do It, Sixth (revised)

←

(ڕۆناڵـد لاتـۆڕێ Ronald A. LA Torre) لە کتێبەکەیدا (ناسنامەی ڕەگەزی)، باس لەوە دەکات کە ئاراستەی سێکسی لە دەرەوەوە دەمژرێـــت و ئاراســـتە دەکرێـــت. ئەمە لە لایەن ژنە مامۆســتای کۆمەڵناســی (ئــامی بەتــلەر Amy Butler)یشەوە پشتڕاست کراوەتەوە و سەرنجی هەموو توێژینەوەکانی داوە، کە لە ساڵی (١٩٨٨)ـەوە دەرچـوون و باسـیان لە ڕێـژەی هاوڕەگەزبازان کردووە لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، توێژینەوەکەی دەریخستووە ڕێژەکە لە دوای سـاڵی (١٩٩١)ــەوە ڕووی لە زیـادبوون کردووە، ئەمەیش هەمان ئەو ماوەیەیە، کە تێیدا بـانگەوازی ڕاگەیاندن بۆ هاوڕەگەزبازی لە هەڵکشاندا بووە و دەرکەوتنی هاوڕەگەزبازان لە فیلم و دراماکاندا بەتێپەڕبوونی کات زیادی کردووە و بووەتە دووئەوەندە.[1]

لە باخچە و قوتابخانەکاندا ئاراستەی پێشکەشکردنی ڕاوێژ و پاڵپشــتی بــۆ ئەو فێرخــوازانەی وا هەســت دەکەیــن مەیلی هاوڕەگەزبازییــان هەیە لە زیادبوونــدایە، ئەم ئاراســتەیە زادەی فشــاری کاربەدەســتان و لۆبییەکــانی هاوڕەگەزبــازییە، کە بانگەشــەی پاراســتنی فێرخــوازە هاوڕەگەزبازەکــان دەکەن، بەڵام

---

(1) Amy C. Butler 2000, Trends in same-gender sexual partnering, 1988-1998. Journal of Sex Research 37: 333-334. edition 2020, p 65

زۆربەی خەڵک ئاگاداری پرسێکی گرنگ نین – هەروەک دکتۆر نیل وایتهێد دەڵێت – ئەویش ئەوەیە، کە هەموو ئەو کەسانەی گومانیان وایە مەیلی هاوڕەگەزییان هەیە لە تەمەنی شانزە ساڵیدا؛ هیچ ساڵێک بەسەریاندا تێناپەڕێت، کە مەیلی ڕەگەزی بەرانبەر نەکەن، تەنانەت بەدەم خواستەکانیانەوە نەچن و لەگەڵ ڕەگەزی بەرانبەردا ئەنجامی نەدەن! دەکرێت هەندێکیان ببن بە هاوڕەگەزباز، بەڵام ئامۆژگاریکردن و کردنەوەی ڕێڕەوەکانی چەسپاندنی هاوڕەگەزبازی لە لای هەرزەکاراندا، کە هێشتا لە دۆخێکی سەقامگیردا نین بۆ بەدەستهێنانی ناسنامەی سروشتی سێکسیی سەقامگیر، زۆرجار لەمپەرێکە لە بەردەم بەدەستهێنانی ئەو ناسنامەیە؛ نەک هەنگاوێک بێت بۆ پێشەوە. ئەو منداڵانەی نیشانەکانی ناسەقامگیریی ناسنامەی سێکسییان لە لا دەرکەوتووە، یان ئەوەی لە ئێستادا بە ناسەقامگیریی ناسنامەی جۆری ڕەگەزی Gender Dysphoria ناسراوە تێدەپەڕن، دەتوانرێت چارەسەری گونجاویان بۆ باوانیان پێشکەش بکرێت بۆ ناسینی ئەو ڕەگەزانەی بەشدارن لە دەرکەوتنی خواستی هاوڕەگەزبازانە لە بری چەسپاندن و زەقکردنەوەی ئەو خواستە.(1)

لەوەی ڕابرد بۆمان دەردەکەوێت، کە بارودۆخ و هۆکارە کۆمەڵایەتی و ژینگەییەکان ڕۆڵێکی زۆر گرنگیان لە

---

(1) My Genes Made Me Do It.

درووستبوونی ڕەفتاری سێکسیدا هەیە لە لای مرۆڤدا، چونکە جینەکان ناچارمان ناکەن بەوەی هەر کارێک نەمانەوێت بەناچاری ئەنجامی بدەین، ژینگەیش بە هەمان شێوە، بەڵکو ویستێکی ئازادانەمان پێدراوە، کە دەتوانین دەسەڵاتمان بەسەر خواستەکانماندا هەبێت و جڵەویان بکەین.

ئێمە تەنیا بوونەوەرێکی ڕامکراو و ناچارکراوی یاسا ماددییەکان نین، چونکە خودا ویستێکی ئازادانەی پێداوین و عەقڵی پێبەخشیوین، تا بیربکەینەوە و بڕیار لەسەر ئەوە بدەین، کە دەمانەوێت، هەر لەسەر ئەم ئازادیی ویستەیش سزا دەدرێین.

هاوڕەگەزبازی شتێکی فیتری و زکماک نییە، لە ڕووی بۆماوەییشەوە بەسەرماندا نەسەپێنراوە، بابەتەکەیش پەیوەندیی بە ڕەگەزی بەرانبەر، یان هەر ڕەفتارێکی تری مرۆییەوە نییە.

لەڕاستیدا جینەکانمان ناچارمان ناکەن کارێکی دیاریکراو ئەنجام بدەین؛ چ بابەتەکە پەیوەست بێت بە هاوڕەگەزبازییەوە، یان تێکچوونی ڕەوش و میزاج، یان میزکردن لە پێخەفدا، یاخود ئالوودەبوون بە مادده هۆشبەرەکان و شیرینی و... هتد، کە جیناتمان هیچ پەیوەندییەکیان پێیانەوە نییە.

لە ڕەفتاری مرۆییدا هەموو شتێک سروشت و گەشەسەندنە، بەبێ جینات بە هیچ جۆرێک ناتوانرێت کار لە ژینگە بکرێت، بەبێ

ژینگەیش هیچ شتێک کار لە جینات ناکات و هیچ ڕەفتارێک بەرهەم نایەت بە هاوڕەگەزبازییشەوە، کە جینەکان بەتەنیا ناتوانن ببنە هۆکاری بەرهەمهاتنیان، هەروەک دکتۆر نیڵ وایتهێد دەیڵێت.[1]

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## ئارەزوو، یان ڕزگاری:

کەواتە، بەپێی ئەوەی باسمان کرد، پێویستە بیرۆکەی ناسنامەی سێکسی ڕەت بکەینەوە، نەک ماف بۆ هاوڕەگەزبازان بچەسپێنین، چونکە چالاکیی سێکسی، کە چالاکییەکی غەریزەییە شیاوی هیچ مافێک نییە؛ چ جای ئەوەی دووبارە مرۆڤایەتیی بۆ لە قاڵب بدەینەوە و مرۆڤەکان دابەش بکەین بەسەر کۆمەڵە و دەستەگەلێک لەسەر بنەمای ئایین و ڕەچەڵەک و ڕەگەز و دواهەمینییان لەسەر بنەمای ئاراستەی سێکسی و کورتکردنەوە و پارچە پارچەکردنی مرۆڤ!

دروستکردنی ئەو کۆمەڵانە کارێکی سیاسییە و ئامانج لێی دارشتنی گوتارێکی مافپەروەرانەیە بۆ ئەو کۆمەڵانە، تا لە گۆڕەپانی هەڵسەنگاندنی کردارەکانەوە بمانباتە مەیدانی قسەکردن لەسەر ناسنامەکان، لە کاتێکدا مرۆڤ وەک مرۆڤ شیاوی مافە، نەک وەک هیچ پێگە و ناوێکی تر.[١]

چالاکیی سێکسیی مرۆیی لە ڕووی چۆنیەتیی ئەنجامدانی (بەپێی یاسای سروشتی و شەرعی) واتایەکی ڕەوشتیی هەیە، لە لایەکی تریشەوە بەهای مانەوە، واتا لە لایەک چێژێکی شەرعی و

---

[١] https://bit.1y/3payWul، المثلية الجنسية بين الاختار والطبيعة والهوسة، معتز الخطيب، مركز نهوض للدراسات والبحوث.

سروشتییه له لایه‌کی تریشه‌وه ئامانج لێی مانه‌وه‌ی جۆر و ڕه‌چه‌ڵه‌که، به‌ڵام هاوڕه‌گه‌زبازی ملکه‌چبوونه بۆ بنچینه‌ی چێژ به پێچه‌وانه‌ی یاسا سروشتی و شه‌رعییه‌که‌ی و داماڵراوه له هه‌رچی به‌ها و ڕه‌وشته و خراپه‌یه‌کی گه‌وره ده‌هێنێته به‌رهه‌م، که بریتییه له نه‌مانی ڕه‌چه‌ڵه‌ک، ئه‌گه‌ر بێتو گشتاندنی بۆ بکرێت؛ هه‌روه‌ها سیستمی خێزان ده‌شێوێنێت، ئه‌گه‌ر ڕێگه به هاوسه‌رگیری دوو هاوڕه‌گه‌ز بدرێت.

له کۆندا (ابن حجر الهیتمی) وتوویه‌تی: (نێربازی ده‌بێته هۆی لادرانی په‌رده‌ی شه‌رم و پیاوه‌تی و پشتکردنه له هه‌رچی سیفه‌تی جوامێری و مه‌ردایه‌تی).[1]

له په‌روه‌ردگار داواکارین له هه‌موو به‌ڵا و کاره‌ساتێک پارێزراومان بکات...

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو.

# هاوڕەگەزبازی و
# ئازادی لە ئازاردانی کەسانی تردا

ئـازادی، ئەو درووشـمە بـریقەدارەیە، کە کـۆمەڵ و ڕێکخـراوە داکۆکیکارەکان لە هاوڕەگەزبازی، بەرزیان کـردووەتەوە. کاتێـک دوو کەس بە ویسـتی ئـازادیی خۆیـان دەیانەوێـت پـێکەوە بـژین، بۆچی دەبێت ڕێگرییـان لـێ بکرێـت، لە کاتێکـدا هـیچ کامێکیـان زیانیان بەرنەکەوتووە؟

ئەمە پرس و نکوولیکردنێکە زۆر جار لە پرۆگرامەکانی گفتوگۆ و بڵاوکـــراوەی هەواڵەکـــان و تەنـــانەت زنجیـــرە و درامـــا و فیلمەکانیشـدا دەیبینـین، کە دەوترێـت: بـۆچی دەسـت لە ئـازادیی کەسـانی تـر وەردەدەن؟! جێـی داخە دوو خۆشەویسـت لە یەکـتر بێبەش بـکەن و نەهـێڵن لەگەڵ یەک بـژین! چ زیـانێکی هەیە؟ بـا لێگەڕێین خۆشەویسـتی بە هەمـوو جۆرەکـانییەوە لە کـۆمەڵگەدا بڵاوببێـتەوە و بە خۆشی و ئاشتی بژیین!

چ قســـەگەلێکی جـــوان و ناســـکە، بەڵام بەداخەوە وەک خەونەکەی ئەفلاتوون لە شـارە نمـوونەییەکە (یوتۆپیـا)دا خەون و خەیاڵە.

باشە، با بزانین واقیعی ئەمڕۆمان چی دەڵێت؟ دوای پەنجـا سـاڵ لە دەرکەوتنی هاورەگەزبازی، ئایا دەکرێت ئازادانە و بەبێ زیاندان لە مرۆڤ و خێزان و کۆمەڵگە بوونی هەبێت؟!

## زمانی ژمارەکان:

با بە زمانی ژمارەکان دەست پێ بکەین و نموونەیەک لەسەر بەکارهێنانی ماددە کحولییەکان بهێنینەوە بەر لەوەی بچینە سەر باسی هاوڕەگەزبازی. بەپێی ئاماری (دامەزراوەی تەندروستی بۆ بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشییەکان و خۆپارێزی لە ئەمریکادا Centers sor Disease Control and Prevention)، ئازادیی تاک لە خواردنەوەی مەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بۆ ساڵی ٢٠١٠، نزیکەی چارەگە تریلیۆنێک دۆلار لەسەر باجدەران کەوتووە، کە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییە لێکەوتەکانی بەکارهێنانی لەڕادەبەدەری مەی بووە.[١] بەپێی ئامارەکانی هەمان ناوەند، خەرجی چارەسەرکرنی گرفتە لێکەوتەکانی جگەرەکێشان نزیکەی ٣٠٠ ملیاری ساڵانە بووە.[٢]

لێکەوتەکانی هاوڕەگەزبازی بەپێی تـوێژینەوەیەکی ئەنجوومەنی لێکۆڵینەوە خێزانییەکانی ئەمریکا ( Family Research Council) دەربارەی زیانی تەندروستیی هاوڕەگەزبازی، بریتییە لە: نەخۆشی ئایدز، ئالوودەبوون بە ماددە

(1) Centers dor Disease Control and prevention: https://shortur1.at/CPTY2

(2) Economic Trends in Tobacco: https://shortur1.at/AN157

هۆشبەرەکان و کحولییەکان، خەمۆکی، نەخۆشییە سێکسییە گوازراوەکان؛ شێرپەنجەی قۆلۆن و پرۆستات و گون و مەمک و لەکۆتاییشدا توندوتیژیی خێزانی.(١) هەر بەپێی توێژینەوەکە هاوڕەگەزبازان ئەگەری تووشبوونیان بەم نەخشییانە زیاترە لە کەسانی تر.

با یەک شت لەم لیستە تۆقێنەرە وەربگرین، کە بریتییە لە نەخۆشییە گوازراوەکان لە ڕێی ئەنجامدانی سێکسەوە، کە دەبینین سیستمی چاودێریی پزیشکیی ئەمریکی لە ساڵی ٢٠١٠دا شانزە ملیار دۆلاریان تێدا خەرج کردووە، ئەمە بەپێی داتاکانی ناوەندی بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا.(٢) ئەم ژمارەیە بەشێکە لەو خەرجییەی هەموو کۆمەڵگە باجەکەی دەدات، تەنیا لەپێناو ئەوەی هەندێ کەس ئازادیی تاکەکەسیی خۆیان پەیڕەو بکەن، بەپاساوی ئەوەی زیانیان بۆ کەس نییە! ئەمە دیدێکی کورتبین و بۆچوونێکی هەڵەیە بۆ زیان، وەک ئەوەی زیان تەنیا جۆری ڕاستەوخۆی هەبێت!

ڕەنگە هەندێک لە تاکەکانی کۆمەڵگە بپرسن، بۆچی دەبێت من خەرجیی چارەسەری کەسانێک بدەم، کە بە ویستی خۆیان هەستاون بە ئەنجامدانی کارێکی ئەوتۆ، کە لە ڕووی زانستی و

(1) Is Homosexuality a Health Risk? https://shortur1.at/auz56
(2) Centers for Disease Control and prevention: https://shortur1.at/fNSX8

پزیشکییەوە زیانە جەستەیی و دەروونییەکانی سەلمێنراوە؟ بۆچی تاکی بەڕەوشت و ئاکار دروست باجی ئارەزوو و لادانی کەسێکی تر بدات و زیانی بەربکەوێت؟!

وەڵامەکەی لە ڕاپۆرتێکدایە، کە ناوەندی تەندووستیی (Benenden) لە بەریتانیا ئامادەی کردووە و پرسیاری لە چوار هەزار کەس کردووە لە ساڵی ۲۰۱۵دا. بەپێی ڕاپۆرتەکە نزیکەی (٥٢%)ی بەشداربوان بەو جۆرە وەڵامیان داوەتەوە، کە: (نابێت دەستەبەری (تأمینات)ی تەندروستیی خۆراییی ئەوانە بگرێتەوە، کە - بە ئازادیی ویستی خۆیان - ڕەفتارگەلێک دەکەن، کە زیان بە تەندروستییان دەگەیەنێت، بەدیاریکراوی مەیخواردنەوە و جگەرەکێشان و بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر و سیستمی خۆراکی، کە دەبێتە هۆی قەڵەوی).(١)

ئەمە واتای ئەوەیە، کە مشتومڕی سنوور لەو بابەتانەدا دووبارە گەڕاوەتەوە نێو مەیدان، بەڵام لێرەدا پرسیارێکی تر هەیە: ئایا ئەو باجەی کۆمەڵگە دەیدات تەنیا ئابوورییە؟ بە واتایەکی تر: ئەگەر - بە تیۆرییش بێت - خەرجیی نەخۆشییە لێکەوتەکانی کحول و کارە سێکسییە بێ بەندوبارەکان دابین بکرێت، ئایا گرفتە تەندروستییەکان تەواو دەبن؟ بە هەمان شێوە، ئەگەر کۆمەڵگەی

(1) National-health-report-2015.pdf: https://shortur1.at/fNSX8

هاوڕەگەزبـاز خەرجیـی ئـابووریی هەمـوو نەخۆشـییەکان بگـرێتە ئەستۆ، ئایا کۆژانەکان لەم ئاستەدا دەوەستن؟

وەڵامەکەی زۆر ڕوونە و لە واقیعـی ژیانمانـدایە، ئەو دۆخەی مرۆڤ و کۆمەڵگە پێی گەیشتوون و ئەوەیشی، کە توێژینەوەکـان دەریانخستووە، کارەکە لەم ئاستەدا ناوەستێت و کۆتایی نایەت.

## کاریگەریی هاوڕەگەزبازی لەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگە، تاوان و خراپە و نەخۆشی:

لە وتارێکیدا لە پێگەی کۆمەڵەی پزیشکیی مەسیحی، دکتۆر (ئاندرێ ڤان مۆڵ Andre Van Mol) باس لە مەترسییەکانی هاوڕەگەزبازی دەکات، دەڵێت: "لە دیدی تەندروستیی نیشتمانیدا پرسەکە خودی ئاراستەی هاوڕەگەزبازی نییە، بەڵکو لێکەوتەکانیەتی". لێکەوتەکانی ئەم کردارە هەروەک دکتۆر بە پشتبەستن بە توێژینەوە و ئامار و ڕاپۆرتەکانی ناوەندە پزیشکییەکان باسی کردووە، بەم شێوەیەی خوارەوەن[١]:

- نەخۆشی و هەژانی وەک: ڤایرۆسی ئایدز و بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر و خەمۆکی و دڵەڕاوکێ و هەوکردنی جگەر و نەخۆشییە سێکسییە گوازراوەکانی وەک (گرێی کۆم و سەیلان و زەهری و کلامیدیا) و چەند جۆرێکی دیاریکراوی شێرپەنجە و خواردنەوە کحولییەکان و جگەرەکێشان و ناهاوسەنگیی خواردن و قەڵەوی و... هتد. هەموو ئەو نەخۆشییانە پەیوەستن بە هاوڕەگەزبازییەوە، ئەمە بە وتەی پێگەی دەستەی پزیشکیی هاوڕەگەزبازە پیاو و ژنەکان لە

(1) https://shortur1.at/fgOT9

وتارێکی پزیشکی هۆشیارکەرەوەدا، کە ڕووی قسەی کردۆتە هاوڕەگەزبازان و لە مەترسییەکان ئاگاداریان دەکاتەوە.

- نەخۆشییە گوازراوەکان لە ڕێی سێکسەوە: ئامارەکانی (کۆنگرەی نیشتمانی بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشییە گوازراوەکان لە ڕێی سێکسەوە) لە ساڵی ٢٠١٠، کە سەر بە ناوەندی ئەمریکییە بۆ بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشییەکان و خۆپاراستن لێیان؛ کە تێکڕای دیاریکردنی نوێی ڤایرۆسی ئایدز لە نێوان ئەو نێرانەی نێربازی دەکەن بە ڕێژەی ٤٤ جار زیاترە بە بەراورد بەو پیاوانەی ئەو کارە ناکەن و بە ڕێژەی ٤٠ جار زیاترە بە بەراورد بە ئافرەتە ئاساییەکان. هەروەها تێکڕای تووشبوون بە نەخۆشیی (syphilis- سفلس) سەرەتایی و پێشکەوتوو لە نێوان پیاو و ژنانی هاوڕەگەزبازدا زیاتر بووە بە ڕێژەی ٤٦ ئەوەندەی پیاوانی کەسانی ئاسایی و ٧١ ئەوەندەی ئافرەتانی ئاسایی.

- ناوەندی زاڵبوون بەسەر نەخۆشییەکاندا (CDC) لە پێگەی خۆی لە تۆڕی ئینتەرنێت، هۆشداری بڵاوکردەوە و چەندین زانیاریی لەسەر هەوکردنی ڤایرۆسی جگەر خستەڕوو، بەپێی ڕاپۆرتی ناوەندەکە: ئەوانەی نێربازی دەکەن بە ڕادەیەکی زۆر مەترسیی تووشبوونیان بە هەندێ لە نەخۆشییە گوازراوەکان لە ڕێی سێکسەوە (STDs) هەیە، بە هەوکردنی جگەر A و هەوکردنی B و ڤایرۆسی دابەزینی بەرگریی لەش (ئایدز) و زەهری و سەیلان و کلامیدیا.

بەپێی داتاکان، نزیکەی ١٥-٢٠%ی هەموو حاڵەتەکانی پەتای نوێی ڤایرۆسی هەوکردنی جگەر B لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، لەنێو هاوڕەگەزبازاندایە.

- تەندروستیی دەروونی: ئاماری تەندروستیی دەروونی لە هۆڵەندا (NEMESIS) ئەوەی دووپات کردووەتەوە، کە کەسانی هاوڕەگەزباز زیاتر مەترسیی تووشبوونیان لەسەرە بە هەژانە دەروونییەکان. هەروەها بوونی ناسەقامگیریی میزاج و دڵەڕاوکێیش لەنێو هاوڕەگەزبازاندا دەستنیشان کراوە، ئەمە سەرەڕای هەژانی پەیوەست بە مادده هۆشبەرەکانەوە.

(زانیارییەکان لە وتارەکەی دکتۆر ئاندریێ وەرگیراون).

لە چواری مانگی ئابی ساڵی ٢٠٢٢، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی دانکە (جدري) مەیموونەکانی ڕاگەیاند و وڵات کەوتە باروودۆخی لەناکاوەوە. دە ڕۆژ پێش ڕاگەیاندنی دۆخی لەناکاو، بەڕێوەبەری گشتیی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (تیدرۆس ئەدهانوم گیبریسوس) ئەوەی ڕاگەیاندبوو، کە لە ئێستادا نەخۆشییەکە، تەنیا لەنێو نێربازان و فرە ڕەگەزبازاندا بڵاوبووەتەوە.[١]

[١] حالة طوارئ عالمية بسبب جدري القرود.. ومنظمة الصحة تؤكد تركزه بين الرجال المثليين: https://shortur1.at/iqwS9

لەکۆتایی ئەم بەشەدا، دەبینین کۆمەڵێکی زۆری تویژینەوە و دانراوە زانستییەکان و وتە و گەواهییەکانی پزیشکان، جەخت لەوە دەکەنەوە، کە هاوڕەگەزبازان تێکڕای تووشبوون بە ڤایرۆسی لاوازیی بەرگری (ئایدز) زیاتر دەکەن، ئەمە جگە لە ماددە هۆشبەرەکان و خواردنەوە کحولییەکان و جگەرەکێشان، خەمۆکی و دڵەڕاوکێ و ناهاوسەنگیی خۆراکی و خۆکوشتن و قەڵەوی، هەوکردنی جگەر بە جۆرە جیاوازەکانییەوە و چەندین نەخۆشیی تری گوازراوە لە ڕێی پەیوەندی سێکسییەوە و جۆرە جیاوازەکانی شێرپەنجە و توندوتیژی و دابەزینی تێکڕای تەمەن بە ڕێژەیەکی بەرچاو. هەروەها لە هەمووی خراپتر ئەوەیە، کە ئەو نەخۆشییانە بۆ کەسانی تر و بە چەندین جۆر و شێوازی جیاواز دەگوازرێنەوە.[1]

[1] سەرچاوەی پێشوو، مەترسییە تەندروستییەکانی هاوڕەگەزبازی.

## منداڵی هاوڕەگەزبازان:

چەنـد سـاڵێک بەر لە ئێسـتا، کۆمەڵەکـانی داکـۆکیکردن لە هاوڕەگەزبازی هەڵمەتی فشارکردنیان ڕاگەیاند و داوایان لە وڵاتان دەکرد دەستکاریی یاسا و ڕێساکانیان بکەن بۆ داننان بە مافەکـانی هاوڕەگەزبازان. دوای ئەوەی ئەوەیان بۆ هاتەدی، دووبارە دەنگیـان بەرزبووەوە بۆ ئەوەی ڕێگەیان پێبدرێت خێـزان دروسـت بـکەن و منداڵدان بەکرێ بگرن، یـان منـداڵی یەکێکیـان لە لایەن هاوسـەرە هاوڕەگەزەکەیەوە بەخێو بکرێت. درووشمەکەیان بریتی بوو لە:

(داوای یاسایەک دەکەین ڕێگە بە هاوڕەگەزبازان بدات خێـزان پێکبهێنن).

درووشمێکی وەها بەر لە چەند دەیەیەک شتێکی نامۆ و ڕیزپەڕ بوو، بەر لەوەی ببێتە ناونیشانی سەرەکی ڕۆژنامە بەناوبانگەکان، بـــۆچی؟ چـــونکە هاوســـەرە هاوڕەگەزبازەکـــان توانـــای وەچەخستنەوەیان نییە، هەر بـۆیە ئەوان پێویسـتیان بە دەرچەیەک هەیە تا خۆیـان لە یاسـاکانی سرووشـت بـدزنەوە و بتـوانن خێـزان پێکبهێنن.

ئەگەر مرۆڤ بتوانێت خـۆی لە یاسـاکان بـدزێتەوە و خێـزان لە دوو هاوسەری نێر، یان مێ پێکبهێنێت، ئایا دەتوانێـت بەرەنگـاری

یاساکانی دەروونناسی و کۆمەڵناسی ببێتەوە و منداڵی تەندروست وەک خێزانی ئاسایی پەروەردە بکات؟!

لە پێگە ئەلیکترۆنییەکان و زۆرینەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن ئەوە دەخوێنیتەوە، کە توێژینەوەکان جەخت لەوە دەکەنەوە جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە لە نێوان ئەو منداڵانەی لە خێزانی هاوڕەگەزدا گەورە دەبن لەگەڵ منداڵانی ئاسایی، لە ڕووی مەیلە سێکسییەکان و پێکهاتەی سۆزدارییان! بەڵێ، ئەمە قسەی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی لۆبییەکانی هاوڕەگەزبازانە لە هەڵمەتەکانیان و داواکردنی مافی پێکهێنانی خێزان لە نێوان دوو هاوسەری هاوڕەگەزدا. پێت سەیر نەبێت، کە ئەو توێژینەوانە لە گۆڤارە زانستییەکاندا بڵاوبکرێنەوە، ئەگەر بێتو لۆبییەکان دەسەڵاتی ناوەندە زانستییەکان بگرنە دەست! بەڵام حەقیقەت شتێکی تر دەڵێت، ئەوەی، کە ئەوان نایانەوێت تۆ ئەوە بزانیت. بۆ ئەم بابەتە گەواهیی کەسێک لە کۆمەڵگەی هاوڕەگەزبازیدا وەردەگرین، تا ببێتە بەڵگە بەسەر خۆیانەوە و دوای ئەوە لەو بارەیەوە گوێ لە قسەی زانستیش دەگرین.

(کاتی فاوست Katy Faust) خانمێکە لە خێزانێکی هاوڕەگەزی دوو ئافرەت (دوو دایك)ی بێ باوک گەورە بووە، لە ئێستادا سەرپەرشتیی هەڵمەتێک دەکات بۆ پاراستنی منداڵان لە هەمان ئەو چارەنووسەی خۆی تووشی بووە. لە یەکێک لە دیمانە

تەلەفزیۆنییەکاندا لە تۆڕی هەواڵی ئوسترالی (ABC News) کاتێك لەبارەی پەروەردەکردنی منداڵ لە لایەن دوو هاوسەری هاوڕەگەزەوە دەدوێت، دەڵێت: ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە، کە کاتێک لە بنچینەی خێزان دەکۆڵینەوە و باسی باوکایەتی و دایکایەتی ناکەین، کۆمەڵناسان لەسەر سێ شت کۆڕان:

یەکەمیان: باوکە نابایۆلۆجییەکان نائاسایی و دەستەبژێرین، کات و داهاتێکی کەمتر لە پەروەردەکردنی منداڵدا خەرج دەکەن و مەترسی زیاتریان لەسەر منداڵان هەیە.

دووەم: لە ئەگەری تووشبوونی منداڵ بە هەژانێکی دەروونیی خێزانی، وەک لەدەستدانی یەکێک لە باوک و دایکە هاوڕەگەزەکەی کاریگەریی گەورەتر و درێژخایەنتری بەسەرەوە جێدەهێڵێت.

سێیەم: کۆمەڵناسان لەسەر ئەوەیش کۆکن، کە پیاوان و ئافرەتان هەر یەکێکیان بە شێوازێکی جیاواز ڕەفتار لەگەڵ منداڵەکانیاندا دەکەن.

ئێستا، پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا بڕوات وایە کە ئەمە بەهۆی ئەو توێژینەوانەوەیە، کە دەڵێن هیچ جیاوازییەک بوونی نییە، کە نموونەی هەڕەمەکی بۆ توێژینەوەکان هەڵنابژێرن، بەڵکو

دەرئەنجامەکانی لە نموونەی ئەجێندای تایبەتی خۆیانەوە وەردەگرن؟

لێرەدا (کاتی) بابەتەکە بە وردەکاریی زیاترەوە شی دەکاتەوە و دەڵێت: "کەموکوڕی لەو توێژینەوانەدا هەیە، کە بانگەشەی نەبوونی جیاوازی لە نێوان پەروەردەی منداڵانی ئاسایی و منداڵانی خێزانی هاوڕەگەزدا دەکەن و سەلمێنراوە و ساختەکارانی ئەو توێژینەوانە خۆیان دانیان بەوەدا ناوە، بەڵام ئەو شتانە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندندا باس ناکرێن!"[١] هەروەها دەڵێت: "ئەو منداڵانەی نموونەی وەرگیراوی توێژینەوەکەن، کەس گرنگییان پێ نادات و گوێیان لێ ناگرێت! کەواتە چۆن منداڵەکان وێنەکە دەبینن؟! وەڵامەکەی ئەوەیە، کە زۆرینەی نموونەکانی توێژینەوەکە لە ئەجێنداکانیان و ئافرەتە سپیپێستە خاوەن سامانە زۆرەکان هەڵبژێردراون، کە لەجیاتی منداڵان وەڵامی پرسیارەکانی توێژینەوەکەیان داوەتەوە".[٢] بەم جۆرە بڕوا بە منداڵان هێنراوە، کە نەبوونی باوک و دایک شتێکی ئاساییە و خێزانی هاوڕەگەزباز خێزانێکی سروشتییە و لەو خێزانانە جیاواز نییە، کە لە باوک و دایک پێکدێن.

---

(1) Q&A: Faust, Di Natale disagree on research into same-sex parenting: https://shorturl.at/gPSU9

(2) Same-sex parenting: What does the science really say? | Katy Faust: https://shorturl.at/CLMQS

با گوێ لە گەواهیی کوڕ و کچانی پێگەیشتوو بگرین، کە لە خێزانی هاوڕەگەزبازی باوک و دایکی هەمان ڕەگەز گەورە بوون.

پڕۆفیسۆر (ڕۆبێرت لۆپێز Roberto Lopez) لە زانکۆی کالیفۆرنیا، لە خێزانێکی دوو ئافرەتی هاوڕەگەزبازدا گەورە بووە، لە یەکێک لە دیمانەکانیدا لەگەڵ (MRC TV)ی ئەمریکیدا وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە، کە چۆن لە خێزانێکی هاوڕەگەزدا گەورە بوویت و ئێستا بوویتەتە پیاوێکی تەواو و هاوسەرگیرییشت کردووە و منداڵت هەیە؟ لە وەڵامدا دەڵێت: "وەک کەسێکی هاوڕەگەزباز هەستم کرد شتێکی هەڵە لە ژیاندا هەیە و زۆر لە خۆم دەکەم، تا بتوانم ئەنجامی بدەم، یەکانگیر نەبوو لەگەڵ ئەوەی هەستم پێ دەکرد. کاتێک تەمەنی هەرزەکاریم تێپەڕاند و پێم خستە تەمەنی بیست ساڵییەوە، وام دانا، کە منیش هاوڕەگەزبازم، یاخود دەمەوێت ببم؛ بۆیە پێویستە پەیوەندی لەگەڵ پیاواندا دابنێم، بەڵام بەردەوام هەستم دەکرد شتێکی نامۆ و هەڵە هەیە. بەگوێرەی ئەوەی کۆمەڵگە بەسەرتدا دەیسەپێنێت، هەست دەکەیت بۆ هاوڕەگەزبازان تۆقێنەرە، یان لەبەر ئەوە بووە، کە خۆمم وەک خۆم قەبووڵ نەکردووە. پاشان گەیشتمە ئەو بڕوایەی ئەوەی من هەستی پێ دەکەم شتێکی تایبەتە بە خۆم، دوای ئەوە هاوسەرەکەمم بینی و خۆشم ویست".[١]

[1] Man Raised by Two Lesbians Speaks Out Against Gay Marriage, Adoption: https://shorturl.at/bksvl

لۆپێز خێزانی هاوڕەگەز بە پەیوەندیی کۆیلایەتی وەسف دەکات، کە تێیدا هەردوو لا ڕۆڵی گەورە دەبینن و منداڵێک (کۆیلەیەک) دەکڕن بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانیان.

بارودۆخی پرۆفیسۆر لۆپێز تاکە بارودۆخ نییە و گەواهییەکەی یەکێکە لە دەیان گەواهی، کە تا ئەمڕۆ دەرکەوتوون. لە ساڵی ٢٠١٦دا کتێبی: منداڵان لە خێزانی هاوڕەگەزبازدا قوربانی باوکایەتی و دایکایەتین:

(Jephthah's Children: The Innocent Casualties of Same-sex parenting) گەواهیی حەفتا کەسی پێگەیشتووی تۆمار کردووە، کە زۆربەی چیرۆکەکان ناخهەژێن و تراژیدین؛ لەنێو ئەو چیرۆکانەدا چیرۆکی دوو دانەرەکەی کتێبەکەیە، یەکەمیان پرۆفیسۆر لۆپێز و ئەوی تریان (بریتنی کلین Brittany Klein)، کە بە هەمان شێوە لە خێزانێکی هاوڕەگەزی دوو ئافرەتدا گەورە بووە.

دەربارەی کتێبەکە کلین دەڵێت: "دەمانەوێت ئەم کتێبە وەڵامێک بێت بۆ بانگەشەکارانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، کە گرفتێک لە بوونی دوو باوکی هاوڕەگەزدا نابینن و پێیانوایە هاوشێوەی باوک و دایکە. دەمانەوێت بڵێین: نەخێر! منداڵانیش مافیان هەیە و پێویستیان بە بوونی باوک و دایک هەیە. ئەوان بەم جۆرە لەدایک بوون، هەر بۆیە، ئەگەر دەتەوێت پاساوی (بەم جۆرە

لەدایک بووین) بکەیتە بیانوو، ئەوا لێگەڕێ سەرەتا بە منداڵەکە دەست پێ بکەین، کە بەڵێ بەم جۆرە لەدایک بووە (لە باوک و دایکێک".(١)

## بێباوکی:

گۆڤاری (خێزان و هاوسەری) لە ساڵی ٢٠١٠ توێژینەوەیەکی بڵاوکردووەتەوە، لە دەرئەنجامەکانیدا هاتووە، کە: خێزانە هاوڕەگەزەکان، ئەگەر هەردووکیان نێر بن، ئەوا یەکێکیان ڕۆڵی مێ (دایک) دەگێڕێت، بەڵام ئەگەر هەردووکیان مێ بن؛ هیچ کامێکیان ڕۆڵی نێر (باوک) نابینن. بەم جۆرە منداڵەکە خۆشەویستیی بۆ دوو دایک دەبێت لەبری دایکێک، بەڵام ڕۆڵی باوک لە هاوکێشەکەدا ونە. گرفت لەمەدا چییە؟ لە نەبوونی باوکدا چی دەگوزەرێت؟

بەگوێرەی توێژینەوەکە، باوک زۆر ڕۆڵی هەیە، کە هیچ کەس ناتوانێت لەبری ئەو ئەنجامیان بدات.(٢)

---

(1) Jephthah's Children: The Innocent Casualties of same-Sex parenting: shorturl.at/gsTY1

(٢) في هذا المقال تم ذكر الدراسة المشار إليها: https://shorturl.atgPRZ0

## سەرئەنجام:

لایەنە تاریکەکەی ژیانی هاوڕەگەزبازان بەردەوام خۆی نیشان دەدات، ئەمە سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵ و تەقەللایەی لایەنگرانی بۆ شاردنەوەی دەیدەن، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ مرۆڤایەتی گرفتاری خراپەی زیاتر دەکەن، ئایا ئەمە کۆتایی دێت؟!

باسەکە لە شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە دەستی پێ کرد، بە دەرهێنانی هاوڕەگەزبازی لە ڕێبەری ئاماری هەژانە دەروونییەکان لە ساڵی ١٩٧٣دا، بەڵام ڕۆژانە دەنگەکان بەرزتر و داواکارییەکان زیاتر دەبن بۆ گۆڕینی یاساکان و داڕشتنی یاسای نوێ. لە ئوسترالیا، نەیارانی بەیاساکردنی هاوسەرگیریی هاوڕەگەزبازان داوا دەکەن ڕێیان پێ بدرێت هاوسەرگیری لەگەڵ منداڵەکانی خۆیاندا بکەن، دەڵێن: "ئێمەیش هەمان درووشمی هاوڕەگەزبازان بەکاردەهێنین، بەوەی هەموو جۆرەکانی خۆشەویستی وەکو یەک وان، منیش دەمەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ منداڵەکەی خۆمدا بکەم!"

کەسێکی تر دەڵێت: "ئەگەر بازنەی مافی هاوسەرگیری فراوان دەکرێت، ئەی بۆچی فرەژنی ناگرێتەوە؟ بۆچی سێکسکردن لەگەڵ ئاژەڵاندا ناگرێتەوە؟ ئەم ڕێگەیە بەکوێمان دەگەیەنێت!"

پیاوەکە خاڵێکی گرنگ و جەوهەریی ورووژاندووە! فرەژنی باوترین جۆری هاوسەرگیرییە بەدرێژایی مێژوو، تەنانەت (پێکهاتەی توێکاری و فسیۆلۆجیی پیاو) شیاوە بۆ فرەژنی، هەروەک زانای زیندەوەرزانی (دەیڤید باراش David Barash) لە توێژینەوەکەیدا جەختی لەسەر دەکاتەوە.[1] کەچی کۆمەڵگە خۆرئاواییەکان یاساگەلێکیان چەسپاندووە، کە ڕێگری دەکات لە (ئازادیی ئەنجامدانی ئەم چالاکییە سروشتییە لە دیدی زانستەکانی ئەنسرۆپۆلۆجیادا) تەنانەت، ئەگەر بە ڕەزامەندیی هەموو لایەنەکانیش بێت، کە هەموو لایەنەکانیش کەسانی پێگەیشتوون!

وادیارە یاسا مرۆییەکان دەیانەوێت بەپێچەوانەی یاساکانی سروشتەوە کار بکەن، ئایا ئەمە یاخیبوونە لە بڕیارەکانی بەدیهێنەر؟ ئەگەر هاوڕەگەزبازی بەڕاستی مافێکە لە مافەکانی مرۆڤ – هەروەک بانگەشەی بۆ دەکەن – و ڕەفتارێکی ئاساییە و لە ئاژەڵاندا هەیە و مرۆڤەکانیش لە سەردەمێکی کۆنەوە ئەنجامی دەدەن، کەواتە چ گرفتێک لەوەدا هەیە، کە زۆرینەی مرۆڤەکان ئەنجامی بدەن؟ ئایا ئێمە ئازادین لەوەی ڕەوایەتی بدەین بە ڕەفتارێک، کە ئەگەر ببێتە ڕەفتارێکی گشتی، ئەوا ژمارەی مرۆڤ وردە وردە کەم دەبێتەوە، تا لەکۆتاییدا دەگەینە کۆتایی ڕەگەزی

[1] People Are polygynous: https://shorturl.at/agZ68

مرۆڤایەتی؟! ئایا مافی ئەوەمان هەیە، ئازاری خۆمان بدەین و نەوەی ئایندە لەناوببەین؟! ئەم پێداگرییەی خۆرئاوا لەسەر هاوڕەگەزبازیی و ڕەفتارە لادەرەکان ئاماژەیەکی ڕوون و ڕاشکاوە لەسەر ئەوەی، کە کۆمەڵگەی خۆرئاوایی گرنگی بە مانەوەی ئاینده و مرۆڤایەتی نادات.

﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦﴾ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُوا۟ مَيْلًا عَظِيمًا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ ۚ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴿٢٨﴾ ﴾ (النساء: ٢٦ – ٢٨)

واتە: "خودا دەیەوێت حوکمەکانی حەڵاڵ و حەرامتان بۆ ڕوون بکاتەوە و شارەزای ڕێوشوێن و ڕەوشت و یاسای ئەو پێغەمبەرانەتان بکات، کە بەر لە ئێوە هەبوون، وەکو ئیبراهیم و ئیسماعیل. هەروەها دەیەوێت لە گوناهتان خۆش ببێت و تەوبەتان لێ قەبووڵ بکات و دەیەوێت بتانخاتە سەر ڕێگەیەک، کە ئەنجامەکەی بەختیاری و سەربەرزیی هەردوو دنیا بێت. خودا زانایە و کارەکانی پڕ حیکمەتن.. خودا دەیەوێت ڕێگەی ڕاستتان پیشان بدات و لە گوناهتان خۆش ببێت. ئەو گوناهبارە لە خودا ترسانەیش، کە دوای ئارەزووی نەفس کەوتوون، دەیانەوێت دوای ئەوان بکەون و ڕێگەی چەوت بگرن و بەتەواوی لە ڕێگەی ڕاست

لابدەن و تووشی سزای ڕۆژی جەزا ببن.. خودا دەیەوێت باری سەر شانتان سووک بکات بە دامەزراندنی یاسای هاوسەرگیری و جێگیرکردنی خێزان بەجۆرێکی ئەوتۆ، کە دووربن لە خراپە. بەڕاستی ئینسان لاواز و کەمتوانا دروستکراوە، ئەگەر حوکمەکان سووک نەبن پێی هەڵناگیرێن".

# چەسپاندنی هاوڕەگەزبازیی.. لە سەکۆی سێدارەوە بەرەو بەڵگەنامەی هاوسەرگیری

(چـــالاکییە هاوڕەگەزبازییەکـــان لە کوشـــتن خـــراپترن و سووکایەتی تێیاندا بە ئەندازەیەکی ئەوتۆیە، کە خـۆی جـۆرێکە لە سزا، چێژوەرگرتن لەو کارانە بارودۆخەکە بەرەو خراپتر دەبات).

(قەشە جۆن کریسۆستۆم، لەسەدەی چوارەمی زایینی)

لە ٧ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٤ کۆمەڵگەی زانستی لە بەریتانیا بە هەواڵی مردنی زانای بیرکـاری (ئـالان تۆرینـگ) ڕاچڵەکـی، کە بەهۆی سێوێکی ژەهراوی بە ژەهری سیانید مرد. ئەگەر هەیە خـۆی کوشتبێت، بەڵام چۆن دەگونجێت کەسێ، کە خـاوەنی هەمـوو ئەو دەسـتکەوتانە بێـت، بەم جـۆرە کۆتـایی بە ژیـانی خـۆی بهێنێـت؟! وردەکـارییەک لە چیـرۆکەکەدا هەیە، کە هەمـوو شـتێک ڕوون دەکاتەوە.

ئەو پیاوە نێرباز بوو! تا ئەم دواییانەیش، پاشـماوەی فیـترەت لە پەیوەندییە سێکسییەکاندا لە ئەوروپادا هەر مابوو، هاوڕەگەزبازی

کــارێکی بێــزراو بــوو؛ لە ســاڵی ١٩٥٢ تۆرینــگ بە تــۆمەتی ئەنجامدانی کاری هاوڕەگەزبازی دادگایی کرا، دادگـا سەرپشـکی کرد لە نێوان خەساندن، یان زیندانیکردن، بەڵام بەرگەی خەسـاندنی نەگرت و دوای دوو ساڵ لە وەرگرتنی چارەسەری کیمیایی مرد، کە گومانی زۆر ئەوەیە خۆی کوشتبێت.

بەڵام دوای نزیکەی حەفتـا سـاڵ، ئێسـتا هاوکێشـەکە گـۆڕاوە، ڕەوتی هاوڕەگەزبــازان دزەی کـــردووەتە نێـــو جومگەکـــانی کۆمەڵگەوە لە ئەوروپـادا، تـا ئەو ئەنـدازەیەی بەریتانیـا بڕیاریـدا وێنەی تۆرینـگ بخـاتە سـەر دراوەکەی، وەک جۆرێـک لە داوای لێبــوردنکردن. بەم جــۆرە دیــارترین چیرۆکــی هاوڕەگەزبــازی لە خۆرئاوادا داخرا. بەڵام چۆن بەم ماوە کەمە توانییان خۆیان لە بەنـد و بـارە ئـایینی و کۆمەڵایەتییەکـان ڕزگـار بـکەن، کە بەدرێژایـی سەدەکانی دەسەڵاتی مەسیحییەت لە ئەوروپادا بەدوایـانەوە بـوو؟ چی وای کرد تۆرینگ دوای حەفتا ساڵ لە مردنی، لە تاوانبارێکەوە ببێتە ئایکۆنێکی نیشتمانی؟ چۆن کۆمەڵگەی هاوڕەگەزباز توانییان ئەم هەژموونە بەدەست بهێنن؟!

## بەر لە پەلکەزێڕینە:

مەســـیحییەت لە ئەوروپـــادا لە ســـەدەکانی ســـەرەتایەوە، هەڵوێستەکەی بریتییە لە ڕەتکردنەوەی هاوڕەگەزبـازی، هەروەک زانای لاهووت (کۆینتس تەرتلیان) دەڵێت: "ڕێنماییەکانی (پۆلۆس) جەختیان لەوە کـردووەتەوە، کە هاوڕەگەزبـازی گـۆڕینی فیـترەتی مرۆڤـایەتییە، کە خـودا لەسـەری بەدیـی هێنـاون و گرفتـاربوونی مرۆڤـایەتی بەم ئاکـارە، بەڵا و سـزایەکی خـودایی بـوو بـۆ سـەر بتپەرستان".[١]

لە قۆناغێکدا، (تۆماس ئەکـوینی)ی فەیلەسـووف بۆچـوونی وا بـوو، کە: (دەکرێـت خواسـتەکانی مـرۆڤ لە خواسـتە سروشـتییە ڕەوشتییە بەهاییەکان لابدەن، تەنانەت ئەگەر ئامانجیـان چـاکەیش بێـت، ڕێگەیەکـی وێـرانکەر بەرەو ئەو چـاکە بانگەشـەبۆکراوە دەدۆزێتەوە).[٢]

تەنانەت مەزهەبی پرۆتستانتی ڕۆشنگەرییش هیچ کات لەگەڵ مەیـلە هاوڕەگەزبازییەکانـدا کـۆک نەبـووە، ئەوەتـا پێشـەوای

[1] Robert, A. and Donaldson, J. eds. 1885-1896. Ante-Nicene Fathers, 10 vols. Buffalo, NY: Christian Literature

[2] SUMMA THEOLIGICA: The natural law (prima Secundae partis, Q. 94).

یەکەمی پرۆتستانتی (مارتن لۆسەر) دەڵێت: "خراپەکارییەکەی گەلی لوط بێوێنە بوو، دوور بوو لە هەرچی سۆز و خواستی سروشتییەوە، کە خودا مرۆڤی لەسەر بەدیهێناوە، کە بەپێی ئەوە نێر سۆز و ئارەزووی بەرانبەر بە مێ هەیە'. هەروەها جەختی لەوە کردووەتەوە، کە: "ئەوانەی لە هاوڕەگەزبازیدا نوقم بوون، شەیتان لەخشتەی بردوون و ڕووناکیی ویستی سرووشتیی لە دەروونیاندا کوژاندووەتەوە، هەموویشی ــ بەهۆی نەترسانیان لە خودا و دەرچوون لە یاساکانی".[1]

لە دەرئەنجامی ئەم میراتە لاهووتییە، زۆربەی لاهووتی و تایەفە مەسیحییەکان، ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی بە بێڕەوشتی و تاوانێکی شیاو بە سزا دەبینن.[2]

بەم جۆرە ڕەتکردنەوەی هاوڕەگەزبازی لە ڕووی ڕەوشتییەوە گۆڕا بۆ سزای یاسایی، بەتایبەت لە بەریتانیادا، کە هاوڕەگەزبازیی وەک تاوانێکی قێزەونی ئەوتۆ لە قەڵەم دا، کە شیاوی لێخۆشبوون نییە.

تەنانەت سزای هاوڕەگەزبازی لە ئینگلتەرا لە سەردەمی هێنریی پێنجەمدا لەسێدارەدان بوو، ئەو سزایەیش لە بەریتانیادا

---

(1) Plass, Ewald Martin. What Luther Says: An Anthology, Volume 1, 1959. P. 134.
(2) Pavao, paul F. "Homosexuality Quotes". Christian History for Everyman. Paul F. pavao. Retrieved 30 November 2020.

بەردەوام بوو، تا کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم، تەنانەت لە ساڵی ١٨٨٥دا پەرلەمان سزای بۆ دیاری کرد؛ سزاکەیش بەگشتی لە بەریتانیاوە بۆ ئەورووپا گوازرایەوە. لە ماددەی ١٧٥ی یاسای سزادانی ئەڵمانیدا، سزای هاوڕەگەزبازان بە زیندانی و بێبەشکردن لە مافە مەدەنییەکان دیاری کراوە.[١]

(1) Gay Rights Movement. https://shorturl.at/aiP19

## کۆمەڵگەی هاوڕەگەزبازان:

تـــا کۆتـــایی ســـەدەی نـــۆزدەیەم، هـــیچ بزووتنەوەیەکـــی کـــۆمەڵایەتیان نیـــیە، کە داکۆکییـــان لە مـــافی هاوڕەگەزبـــازان کردبێـــت، چـــونکە هەموویـــان دەیـــانزانی هاوڕەگەزبـــازی لادانە و دەرچـــوونە لە یاســـا سروشـــتییەکان. یەکەمـــین بـــزووتنەوەی داکۆکیکردن لە هاوڕەگەزبازی لەگەڵ دامەزرانی لیژنەی زانستی مرۆڤایەتی، لەسەر دەستی (ماگنۆش هێرسفیڵد) لە بەرلـین سـەری هەڵدا، کە هۆکار بوو بۆ پێدانی مافی هەڵبژاردن بە هاوڕەگەزبازان.

سـەرباری ئەوەیـش، لیـژنەکە لە چەنـدین چـالاکی بـرەودان بە هاوڕەگەزبازیدا بەشداریی کـرد، ئەمەیـش لە ڕێـی بڵاوکـردنەوەی چەندین بەرهەم، کە بانگەشەیان بۆ ئازادیی سێکســی دەکـرد. ئەمە جـگە لە پشـتگیریکردن لە گردبـوونەوەی هاوڕەگەزبـازان، کە بە چەندین شێواز پشتگیریی لێ کـرا بـۆ گـۆڕینی یاسـا لە ئەڵمانیـا و هۆڵەنـدا و نەمسـادا. دوای تەنیـا چـارەکە سـەدەیەک، لیـژنەکە نزیکەی ٢٥ لیژنەی لاوەکیی بۆ پشـتگیریکردن لە هاوڕەگەزبـازان لە چەندین وڵاتی ئەورووپیدا دروستکرد.

لە لایەکی تریشـەوە، (پەیمانگـای زانسـتە سێکسـییەکان)ی لە

ئەڵمانیا دامەزراند، کە چەند ناوەندێکی تری بەدوادا هات، لەوانە (پەیمانگای کینزی بۆ توێژینەوە سێکسییەکان و جێندەر و وەچەخستنەوە) لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا.

ئەو ناوەندانە هەڵمەتێکی جیهانییان ڕاگەیاند بە ناونیشانی (چاکسازیی سێکسی) لە کۆپنهاگن. ئەگەرچی لە پەکخستنی ماددەی ١٧٥دا سەرکەوتوو نەبوون، بەڵام توانییان ئازادییەکی زۆر بۆ هاوڕەگەزبازان لە ئەڵمانیادا فەراهەم بکەن. هەروەها سەرەڕای کارایی یاسای ١٧٥، کەچی کاربەدەستان لەگەڵ کۆبوونەوەی شەوانەی هاوڕەگەزبازاندا بێ کاردانەوە بوون. هەندێ دەڵێن ژمارەی یانە و گۆڤارەکانی هاوڕەگەزبازان لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا، زیاتر بوو لە هەموو ئەوانەی دوای شەش دەیە لە شاری نیویۆرکدا پەیدابوون.

بەڵام لەگەڵ گرتنەدەستی دەسەڵات لە لایەن نازییەکانەوە، دووبارە پرسەکان گەڕێنرانەوە سەر شێوازی جاران، ئەمەیش دوای سووتاندنی (پەیمانگای هێرسفیلد) و کاراکردنەوەی ماددەی ١٧٥.

بەڵام بزووتنەوەی کۆمەڵایەتیی هاوڕەگەزبازان لە چەند لایەنێکی ترەوە هەژموونی خۆیان چەسپاند، بەتایبەت دوای کۆتاییهاتنی دووەم جەنگی جیهانی و لادانی نازییەکان لە تەواوی دیمەنەکەدا، هەر لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم و لە ئاستێکی

جیهانیـــدا، ڕێکخـــراوە داکۆکیکەرەکـــان لە هاوڕەگەزبـــازی بە شێوەیەکی بەرچاو زیادیان کرد.

لەوانە (ناوەنـدی ڕۆشـنبیری و خۆشـگوزەرانی)، کە لە سـاڵی ١٩٤٦دا لە شـــاری ئەمســـتردام دامەزرا بـــۆ داکـــۆکیکردن لە هاوڕەگەزبـازی و بەدەسـتهێنانی هاوسـۆزیی کـۆمەڵگە بۆیـان؛ هەروەهـا ڕێکخـراوی (متاشـین) بـۆ نێربـازان، کە لە سـاڵی ١٩٥٠ دامەزرا و لە تەواوی لۆس ئەنجلۆس و ویلایەتە یەکگرتووەکانـدا بانگەشـەی بـۆ هاوڕەگەزبـازی دەکـرد، لەسـەر ڕێـڕەوی ئەو، ڕێکخراوی هاوڕەگەزبازیی (بیلیتس) لە سان فرانسیسکۆ لە ساڵی ١٩٥٥ دامەزرا بـۆ بەدەسـتهێنانی پشـتگیریی کـۆمەڵگەیی بـۆ کۆمەڵگەی هاوڕەگەزبازان.(١)

سەرباری ئەوە، ویلایەتە یەکگرتووەکان دەورییەکی نیشتمانیی بۆ هاوڕەگەزبازان بەخۆیەوە بینـی. ئەم دەوریـیە لە سـاڵی ١٩٥٨دا بڕیـاری دادگـای بەدەسـتهێنا، کە ڕێـگەی دەدا نووسراوەکانیـان لە ڕێـی خزمەتگـوزاریی پۆسـتەوە بنێـرن. بەر لەوە بە سـاڵێک، بەدیاریکراوی لە بەریتانیا، کە لە هەمـوو وڵاتـانی تـری ئەورووپـی توندتر بوو بەرانبەر بە هاوڕەگەزبازی؛ لیژنەیەک بەسـەرکردایەتی

---

(1) Harry Hay, Early proponent of Gay Rightsm Dies at 90: The New York Times.

(سێر جۆرن وۆڵفندن) پێکهات، کە ڕاپۆرتێکی دەرکرد و تێیدا داوای دەکرد هەرچی سزای یاسایی هەیە لەسەر پەیوەندییە سێکسییەکان لابدرێت، کە لەنێو کەسانی باڵغدا بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە ئەنجام دەدرێت. دوای تەنیا یەک دەیە، پەرلەمان ئەو بڕیارەی خستە بواری جێبەجێکردنەوە و هەموو سزایەکی لەسەر ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی لە نێوان کەسانی باڵغدا، کە بیست و یەک ساڵ، یان گەورەترن هەڵگرت.. پاشان لە ساڵی ١٩٩٤دا ئەو تەمەنە کەم کرایەوە بۆ هەژدە ساڵ ، پاشان لە ساڵی ٢٠٠١دا بۆ شانزە ساڵ کەم کرایەوە.[١]

لەو کاتەوە، بزووتنەوەی مافی هاوڕەگەزبازان دەستی کردووە بە سەپاندنی ئەجێندا تایبەتەکانی لە ئازادییە درۆیینەکەیدا، بەتایبەت لە ئەورووپای خۆرئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکاندا. دەکرێت دیارترین ڕووداو لە مێژووی کۆمەڵگەی هاوڕەگەزبازیدا لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بوو بێت، بەدیاریکراوی لە کاتژمێرە سەرەتاکانی بەرەبەیانیی ڕۆژی ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٦٩دا، کاتێک پۆلیسی نیویۆرک هەڵیکوتایە سەر یانەی (ستۆنوۆڵ Stonewall Inn)ی تایبەت بە هاوڕەگەزبازان وگێرەشێوێنیی زۆری بۆ ماوەی چەند شەوێک لێکەوتەوە، کە هاوڕەگەزبازان بە شۆڕشی دەرگاکەرەوەی دادەنێن. هەر بۆیە ساڵانە لەگەڵ هاتنی مانگی

---

[1] Wolfenden Report: shorturl.at/cHJM9

حوزەیراندا، لە ژێر ناونیشانی مانگی فەخر و شانازیی ئاهەنگ دەگێڕن.[1]

لە دەرئەنجامی ئەم ڕووداوەدا، لە حەفتاکان و هەشتاکاندا، بڵاوبوونەوەی بەربڵاوی ڕێکخراوە سیاسییەکانی هاوڕەگەزبازانی لە شوێنە جیاوازەکانی جیهانی خۆرئاواییدا لێکەوتەوە. چالاکوانە هاوڕەگەزبازەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دزەیان کردە نێو هەموو جومگە سەرەکییەکانەوە، بۆ نموونە: حیزبی دیموکراتەکان لە بەرنامەی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٨٠دا پشتگیریی خۆیان بۆ هاوڕەگەزبازان دووپات کردەوە و بووە هۆی ئەوەی چەندین پلەوپایەی سیاسی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا وەربگرن، وەک (جێری دیگریک، نانسی و ویشڵ). هەروەها چالاکوانی ئەمریکیی هاوڕەگەزباز (هارڤی میلک) وەک ئەندامی ئەنجوومەنی سەرپەرشتیاران لە سان فرانسیسکۆدا هەڵبژێردرا، (جێری ستۆدز)یش بوو بە یەکەمین ئەندامی هاوڕەگەزباز لەنێو کۆنگرێسدا، لە ساڵی ١٩٨٣. هەروەها (تامی باڵدوین) لە ویلایەتی ویسکۆنسن بوو بە یەکەمین ژنە سیاسەتوانی هاوڕەگەزباز، کە لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکادا لە ساڵی ١٩٩٨ و بۆ ئەنجوومەنی پیران لە ساڵی ٢٠١٢دا هەڵبژێردرا. لە ساڵی ٢٠٠٩دا ژنە هاوڕەگەزباز (ئەنیس پارکەر) بوو بە سەرۆکی شارەوانیی

[1] Annise parker: https://shorturl.at/eGPY0

شاری هیوستن. دواتریش بڕیاری دادگای باڵای ئەمریکی بۆ ساڵی ٢٠١٥ ئەڵقەی کۆتایی بۆ زنجیرەی بزووتنەوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی کۆمەڵگەی هاوڕەگەزبازان دانا، بە دانان بە مافی یاسایی هاوسەرگیریی هاوڕەگەزبازان، کە بەم بڕیارە، هاوڕەگەزبازی تاوانی سەردەمەکان؛ لە سەکۆی سێدارەوە هێنرایە خوارەوە بۆ چەسپاندنی لە بەڵگەنامەی هاوسەرگیریدا، تەنیا لە ماوەی یەک سەدەدا!

دەتوانیت پەی بەو گۆڕانکارییە گەورە و ڕاستەقینەیە ببەیت کە بەسەر دیدی خۆرئاواییدا هاتووە بەرانبەر بە هاوڕەگەزبازی؛ لە تاوانێکەوە، کە شیاوی کوشتن بێت بۆ مافێک، کە ئەجێندای سیاسی و ڕاگەیاندن بەسەر هەمواندا فەرزی دەکەن. ئەم گۆڕانکارییە لەبنەڕەتدا سیاسی و ڕاگەیاندنکاری نەبوو هێندەی ئەوەی گۆڕانکارییەکی هزری بوو، کە مەبەستمان لێی ئەو گۆڕانکارییانەیە دوای شۆڕشی پیشەسازی لە فەرەنسادا بەسەر ئەوروپادا هاتن، کە بەتەواوەتی خۆیان لە دەسەڵاتی ئایین ڕزگار کرد و چوونە ژێر هەژموونی عەقڵی مرۆیی و ئارەزووە تاکەکەسییەکانەوە، یان بە گوزارشتێکی کورتتر (لە بەرژەوەندیی مۆدێرنەدا).

لەوانەیە پێناسەیەکی وردمان نەبێت بۆ مۆدێرنە وەک وشە، هەروەها دەکرێت مێژوویەکی دیاریکراومان نەبێت، کە تێیدا

توانیویەتی هەژموونی خۆی بەسەر شتەکاندا بسەپێنێت، چونکە ئەم هەژموونە بە شێوەیەکی پلەبەند و خۆکرد ڕوویداوە؛ هاوشێوەی کەوتنی پوولەکانی دۆمینە، کە ئەگەر هێزێک یەکێکیان بخات، ئەوە هەموویان بەدوایدا دەکەون. بۆ تێگەیشتن لەم باسە پێویستە باسی ئەو بنچینە فەلسەفییانە بکەین، کە مۆدێرنەیان لەسەر دامەزراوە و بۆمان ڕوون دەکاتەوە چۆن ئەم گۆڕانکارییە مێژووییە لە کاروانی هاوڕەگەزبازیدا ڕوویداوە، کە یەکەمین بنچینەی بریتییە لە گۆڕانی بەردەوام.

مۆدێرنەی خۆرئاوایی نموونەیەکی جیاوازتری لە نموونەی ئایینی پێشکەش کرد، کە نەگۆڕەکان و بیروباوەڕی گۆڕی بۆ گۆڕانکاری لە هەموو شتێکدا، هەروەک مێژوونووس (ئارنێست رینان) دەڵێت: "مۆدێرنە گۆڕانکاریی خستە جێی جەوهەر و ناوەڕۆکەوە و ڕێژەیی خستە جێی ڕەهاوە و جووڵەی لە جێی وەستان دانا، تا وای لێ هات گەردوونی نوێ - بە گوزارشتی تۆماس هیکسلی - بوو بە گەردوونێکی نابەردەوام و ناجێگیر".[1] ئەمەیش کاریگەریی لەسەر دامەزراوەی خێزان و هاوسەرگیریی ڕۆڵە سێکسییەکان دروست کرد. کاتێک ڕەها دەڕووخێنرێت و هەموو شتێک دەبێتە ڕێژەیی، ئەوا مەیل و خواستە هاوڕەگەزبازییەکان دەبنە شتگەلێکی ڕەوا و داکۆکی لێکراو و

[1] العقل الحضاري العربي، العدد ٥١، عام (١٩٨٩م)، ص (٨٠-٨١)

مافی بوون و دەرکەوتنیـان وەک هەر خواسـتێکی تـری سروشـتی دەبێـت. ئەم بنەمـا مـۆدێرنە سـەرەتاییە، نەیـدەتوانی هاوکـاریی هاوڕەگەزبازان بکات، ئەگەر بنچینەیەکـی فەلسـەفی نەبـوایە، کە بریتییە لە (داماڵینی پیرۆزییەکان).

کەواتە هیچ شتێک پیرۆز نییە، دوای ئەوەی حوکمی ئـایینی لە ئەورووپادا کەوت و مرۆڤ دەسەڵاتی شـتەکانی گـرتە دەسـت، بەم شێوەیە تاکە پیرۆزی لە جیهانی مۆدێرنەی خۆرئاواییـدا ئەوە بـوو، کە لە ئەمڕۆوە هیچ شتێک پیرۆز نیـیە، چـونکە لە پیرۆزییەکانـدا پێوەری کۆن بەدی دەکات، کە لە سەردەمانی کۆندا پەیڕەو کـراون و لەگەڵ سەردەمی بەخودادانانی مرۆڤدا نایەنەوە؛ ئەمە هەمان ئەو قسـەیەیە، کە فەیلەسـووفی ئەڵمانـی (یـۆرگن هاپەرمـاس) باسـی دەکات بەوەی، کە سەردەمی نوێ بازنەی بەها تایبەتەکانی زانست و ڕەوشــت و هــونەری سـنووردار کـردووە، بەوپێـیەی گفتوگـۆ زانستییەکان و توێژینەوە ڕەوشتی و یاسـاییەکان و بەرهەمهێنـانی هونەری بوونەتە کاری پسپۆڕان.

بەم شـێوەیە خەڵـک مـافی ئەوەیـان نیـیە بە پشتبەسـتن بە بیروباوەڕی ئایینییان بڕیار لەسەر ئەوە بدەن، کە چـی ڕەوشـتییە و چی نا، بەڵکو پێویستە ئەم حوکمە بۆ کەسـانی پسـپۆڕ لێگەڕێـین. هەر بۆیە بانگەشەی سەلماندنی ڕەسەنیی هاوڕەگەزبـازی لە ڕووی

بایۆلۆجی و مێـژووییەوە لە ناوەنـدە زانسـتییەکانەوە پەیـدا بـووە، چونکە پسپۆڕان لەو بوارەدا هاوشێوەی ڕەوشت قسەیان دەڕوات!

لە جیهانی مۆدێرنەدا هەرچـی نەریـت و سروشـتی مرۆڤەکـانە، تەنـانەت ئـایین و ڕەوشـتیان و هەرچـی پیرۆزییەکیـان هەبـوو لەدەستیان دا، پیرۆزییەکی تر جێی گرتوونەتەوە، ئەویش گوتـاری زانستییە، کە پەنای دەبرێتەبەر؛ بەوپێیەی دەسەڵاتێکی ڕەوشـتییە و لە سەرووی ئایینەوەیە.

لەپێنـاو هەمـوو ئەوانەدا، گرنگیـی دامەزرانـدنی هـزری لە کۆمەڵگە مسوڵمانەکاندا دەردەکەوێت، کە پێویستە لە دەوری یاسا و ڕێسـا پیـرۆزە نەگۆڕەکـانی خـودادا بخـوولێنەوە، هـیچ گۆڕانکارییەکیان بەسەردا نەیەت و پیرۆزییان لەبەر دانەماڵرێـت؛ لەم ڕووەوە دەقەکـانی قورئـان و فەرمـوودە نەگـۆڕن و شـیاوی گۆڕان نین.

ئەگەر گۆڕانکـاری لە ئـایین و گـاڵتەکردن و دەسـتکاریکردنی یاسـا و ڕێسـا خوداییەکـان نەبـوایە، بە هـیچ جۆرێـک ئەورووپـا نەدەخلیسـکایە نێـو زەلکـاوی هاوڕەگەزبـازییەوە، پینەکـردنی شەریعەتی مەسیحی بە پەڕۆی مۆدێرنە بە هیچ جۆرێک جەسـتەی ئایین پۆشـتە ناکـاتەوە، پەروەردگـار ڕاسـتی فەرمـووە: ﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ

ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾ (المائدة: ٧٧)

واتە: "پێیان بڵێ: ئەی کیتابییەکان! بەناحەق زیادەڕەوی لە ئایینی خۆتاندا مەکەن و مەکەونە شوێنی ئارەزووی نەفسی کۆمەڵێک، کە لەمەوبەر گومڕا بوون و گەلێك خەڵکیشیان گومرا کرد و لە ڕێگەی ڕاست و ڕەوان لایاندابوو".

## کارەسات لە سێبەردا..
## جیهانی نهێنیی خێزانە هاوڕەگەزبازەکان

گەوجاندنێکی بەئەنقەست، گومڕاکردنێکی بەمەبەست، شاردنەوەی ڕاستییەکان، یاریکردن بە دەرئەنجامی توێژینەوەکان. ئەمەیە پوختەی سروشتی خێزانە هاوڕەگەزبازەکان.

هەرکات پرسیاری لەم چەشنە کرا: دۆخی تەندروستی دایبابی هاوڕەگەزباز چۆنە؟ دەرئەنجامی گەشەکردنی منداڵان لە دایبابی هاوڕەگەزدا چۆنە؟ ئەو ئامار و توێژینەوانە چین، کە باس لە تەندروستیی دەروونی دایبابی هاوڕەگەز و منداڵەکانیان دەکەن؟ ئەوە لە سەرەتادا ئەوەت بۆ دەردەکەوێت، کە هاوسەرگیریی هاوڕەگەزبازان وەک و هاوسەرگیریی دووڕەگەزەکە: جیاوازییان نییە! منداڵەکانیشیان هیچ گرفتێکی جیاواز لەوانی تریان نییە، پەروەردەش لەسایەی خێزانە هاوڕەگەزبازەکاندا هەر وەک خێزانە دوو ڕەگەزەکەیە...

بەڵام دوای قووڵبوونەوە و ڕۆچوون لە وردەکارییەکاندا، وردە وردە تەپ و تۆز لەسەر وێنەکە لادەچێت و ڕاستییە شاراوەکان

دەردەکەون. چەنـــد تـــوێژینەوەیەک لەو بـــارەیەوە هەن، بەڵام سەرکوت کراون، کەواتە وەڵامـی پرسـیارەکەمان چیـیە؟ ڕاسـتیی دۆخی تەندروستیی دەروونیی هاوڕەگەزبازان چییە؟ منـداڵەکانیان لەو ژینگە خێزانییە نامۆیەدا چۆن دەژین؟

## باوانی نەخۆش:

چیرۆکی کۆژانی خێزانە هاوڕەگەزبازەکان دوای ئامارەکان دەستی پێ کرد، دەریانخست ئەو بارودۆخەی هاوڕەگەزبازان لە جیهانی خۆرئاوادا تێیدا دەژین بارودۆخێکی خراپە و ژینگەیەکە پڕە لە نەخۆشی، هەر بۆیە بەپێی توێژینەوەیەک خۆکوژی لەنێو زۆرینەی هاوڕەگەزبازاندا، دە ئەوەندەی کەسانی ئاساییە.

هەروەها دە ئەوەندەی کەسانی ئاسایی هیرۆیین بەکاردەهێنن و سێ ئەوەندەی کەسانی ئاسایی ئالوودەی ماددە کحولییەکانن. هەموو ئەمانە ڕەفتارگەلێکن، کە تەنیا زیانیان بۆ تاک نییە، چونکە ڕەفتاری وەک خۆکوشتن و ئالوودەبوون بە هیرۆیین و ماددە کحولییەکان دەتوانێت ژیانی خێزانی بەتەواوەتی هەڵبوەشێنێتەوە و تاکەکانی خێزان سەرگەردان بکات. تەنانەت، ئەگەر خێزانە هاوڕەگەزبازەکان لەو ڕەفتارە زیانبەخشانەیش ڕزگاریان ببێت، ئەوا بەدەست هەژانی دەروونییەوە دەناڵێنن، کە ڕێژەکەی زۆر لە هاوتەمەنەکانیان لە خێزانی دووڕەگەزدا زیاترە. بەپێی ئاماری ڕێکخراوی (NEDA)، کە چالاکی بواری ناسەقامگیریی خۆراکییە، هاوڕەگەزبازان گرفتی ئارەزووی

خـــواردن و زۆرخۆرییـــان هەیە بە ڕێـــژەی ١٠ تـــا ١٥ ئەوەنـــدەی هاوتەمەنەکانیان لە کەسانی ئاساییدا.[١]

هەروەک ناوەنـــدی بەرەنگـــاربوونەوەی نەخۆشـــییەکان لە ئەمریکادا ڕایگەیاندووە، کە هاوڕەگەزبازان بەدەسـت هەژانی دوو جەمسەرییەوە دەناڵێنن، بە ڕێژەیەکی زیاتر لە کەسانی ئاسـایی، بە هەمان ئاست و شێواز خەمـۆکیی تونـد؛ دڵەڕاوکێـی درێژخـایەن و هەژانە دەروونییەکانی تر.

تەنانەت، ئەگەر باوکە هاوڕەگەزبازەکە لە هەموو ئەو ڕەفتارە زیانبەخش و هەژانە دەروونییانەیش ڕزگاری ببێت، هێشتا وەک کەسانی ئاسایی ناگاتە دۆخی هێمنی و ئارامی و گونجان لەگەڵ دەروون و خودی خۆیدا. بەپێچەوانەی ئەوەی ئەجێندای هاوڕەگەزبازان بانگشەی بۆ دەکات، پێناسەی مرۆڤ بۆ خۆی بەوەی هاوڕەگەزبازە، نابێتە هۆی نەهێشتنی ناڕوونی و دۆشدامان بەرانبەر بە خواست و ئارەزووە سێکسییەکانی، چونکە زۆرێک لە دوانەڕەگەز و هاوڕەگەزەکان هێشتا ئاراستەی سێکسیی خۆیان نازانن؛ تەنانەت دوای هاوسەرگیرییشیان لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیاندا، ئەمەیش بتی ئەفسانەی (ئاسوودەیی) دەشکێنێت، کە ئاراستەی هاوڕەگەزبازی بانگەشەی بۆ دەکات.

---

[1] Ronald O. Valdiserri, Richard J. Wolitski, Ron Stall. Unequal Opportunity: Health Disparities Affecting Gay and Bisexual Men in the United States.

توێژینەوەیەک دەریخستووە، کە نزیکەی دوو لەسەر سێی ئەو کەسانەی لە قۆناغێکی ژیانیاندا هەستیان کردووە هاوڕەگەزبـازن، دوای شـەش سـاڵ ئاراسـتەی سێکسـییان گۆڕیـوە بـۆ ڕەگەزی بەرانبەر و وازیان لە هاوڕەگەزبازی هێناوە.[١]

هەروەک چۆن توێژینەوەکی تـر دەریخسـتووە، کە دوو لەسـەر سێی هاوڕەگەزبازە نێر و مێیەکان، لە ماوەیەکی کەمتردا خواسـتی خۆیان دەگـۆڕن بـۆ ڕەگەزی بەرانـبەر، بەدیـاریکراوی دوای پێـنج سـاڵ. ئەمەیە بـارودۆخی تەندروسـتی و دەروونـی و سێکسـیی تـایبەتی دایبـابی هاوڕەگەزبـاز، ئەی کەواتە دەبێـت بـارودۆخی خێزانییان چۆن بێت؟![٢]

---

(1) Scrutinizing Immutability: Research on sexual Oreintation and U.S Legal Advocacy for sexual Minorities.

(2) Diamondm Lisa M.; J. Rosky, Clifford (2016). Scrutinizing : Immutability: Research on sexual Oreintation and U.S Legal Advocacy for sexual Minorities. The Journal of Sex Research, 1-29.

## هەڵوەشانەوەیەکی بێ چاکبوونەوە

لەتەک خراپیـــــی لایەنی دەروونــــی و کەســـیی دایـــابی هاوڕەگەزبازدا، دۆخی خێزانییان خراپتر و شپرزەترە.

زۆر تـویژینەوە باسـیان لەوە کـردووە، کە هاوڕەگەزبـازان زۆر زیـاتر ناپـاکی هاوســەری ئەنجـام دەدەن، بە بەراورد بە کەسـانی ئاسایی.(١)

یەکێک لە توێژینەوەکان، کە لەسەر دڵسۆزی هاوسەری کراوە، دەریخستووە ٧٥%ی پیاوانی ئاسـایی دڵسـۆزی هاوسـەرەکانیانن، بەڵام بەگوێرەی هەمان توێژینەوە، دەرکەوتـووە، کە تەنیـا ٤,٥%ی هاوسەرە هاوڕەگەزەکان دڵسۆزی یەکترن.(٢)

لە توێژینەوەیەکی هاوشێوەدا دەرکەوتووە، کە تەنیا ٩%ی نێـرە هاوڕەگەزبازەکان، یەک هاوبەشی سێکسـییان هەیە، بەو واتـایەی لە هەر دە خێزانێکـــی پێکهــاتوو لە دوو نێـــر؛ نۆیـــان ناپـــاکیی هاوسەری ئەنجام دەدەن. دەکرێت هەر ئەمەیـش هۆکـاری بەرزیـی ڕێـــژەی تەڵاق بێـــت لەنێـــو هاوڕەگەزبازانـــدا، کە بەپێـــی

---

(1) Laumann, The social Organization of Sexuality, 216; McWhirter and Mattison, The Male Couple: How Relationships Develop (1984): 252-253: Wiederman, "Extramarital Sex," 170.

(2) David p. McWhiter and Andrew M. Mattison, The Male Couple: How Relationships Develop (Englewood Cliffs: prentice-Hall, 1984): 252, 253.

توێژینەوەیەک، کە لە سوید و نەرویج ئەنجام دراوە، دەرکەوتووە پیاوانی هاوڕەگەزباز بە ڕێژەی ٥٠% زیاتر مەیلیان بە لای جیابوونەوەدایە، کەچی ڕێژەکە بۆ ئافرەتە هاوڕەگەزبازەکان سەرسووڕهێنەرە و ئەوان ١٦٧% ئەوەندەی ئافرەتانی ئاسایی مەیل و ئارەزووی جیابوونەوەیان هەیە.[١]

وەک دەرئەنجامێکی سروشتی، بەهۆی ئەم فرە هاوسەرییە بێ کۆت و بەندانە و خیانەتە یەک لە دوای یەکەکان، پەیوەندییەکان لەنێو هاوڕەگەزبازەکاندا بەردەوامیی نییە. بەپێی ئامارێکی ویلایەتە یەکگرتووەکان ٢٩%ی هاوڕەگەزبازانی نێر پەیوەندییەکەیان، تەنیا حەوت ساڵی خایاندووە و تەنیا ٩%یان بۆ ماوەی زیاتر لە ١٥ ساڵ بەردەوام بوون. بەپێچەوانەوە، لە توێژینەوەیەکی هاوشێوەدا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەوە دووپات کراوەتەوە، کە ٥٠%ی پەیوەندیی هاوسەرێتیی نێوان پیاو و ژن بۆ ماوەی پتر لە ٢٠ ساڵ، یان زیاتریش بەردەوام دەبێت.

دوای ئەوەی زیان و کاریگەری پەیوەندییە هاوڕەگەزییەکانمان بەسەر تاکەوە باس کرد و باسمان لە لایەنی سەقامگیری و ژیانی هاوڕەگەزبازان کرد، ئێستا دێینە سەر پرسیاری سێیەم و گرنگترین: چۆن ماڵی هاوڕەگەزبازان کاریگەری بەسەر منداڵانەوە دەبێت؟

---

(1) CHARLES C. W. COOKE, The Gay Divorcees Timothy J. Daily, Comparing the Lifestyles of Homosexual Couples to Married Couples.

## قوربانییەکانی ئەجێنداکە دیارن:

چـی بە کەسـێک دەڵێیـت، کە چـاوەڕێی دووریـنەوەی گەنـم دەکـات لە کێڵگەیەکـدا، کە زەیتـوونی تێـدا چانـدووە؟ باشـە، چاوەڕێی چی لە منـداڵێک دەکەیـت، کە لە ژینگەیەکـی شـێواوی دوو هاوڕەگەزدا گەورە دەبێت؟ دەکرێت منداڵەکە چـۆن دەربچێـت لە ژینگەیەکـدا، کە پـڕە لە مەترسـیی دەروونـی و تەندروسـتی و خێزانی؟ جگە لە تووشـبوون بە هەمـان نەخۆشـییە بڵاوەکـانی نێـو ژینگەکە، چاوڕێی چیتر بکەین؟ هەر بۆیە، لە دەرئەنجـامی ڕێـژەی بەرزی هەڵوەشـانەوەی خێـزان لەنێـو هاوڕەگەزبازانـدا، ئەوا سەرچاوەکانی داهاتیش بە نەبـوونی یەکێکیـان زۆر کەم دەکـات، لەبەر ئەوەیە (پەیمانگای ویلیامز) باسـی لەوە کـردووە، کە منـداڵی هاوسـەرە هاوڕەگەزەکـان، دوو ئەوەنـدەی منـداڵی هاوسـەرانی دووڕەگەز هەژارترن و باری گوزەرانیان خراپترە!

هەروەها خراپیـی بـارودۆخی خێـزان و ناسـەقامگیریی دایبـابی هاوڕەگەز کاریگەریی بەسەر منداڵانەوە هەیە. توێژینەوەیەک، کە لە لایەن ئەنجـوومەنی نیشـتمانیی ئەمـریکییەوە بـۆ پەیوەنـدییە خێزانییەکـان بڵاوکـراوەتەوە، دەریخسـتووە منـداڵی

هاوڕەگەزبازەکـان پـلەی ئەکـادیمیی کەمـتر بەدەسـت دەهێـنن لە هاوتەمەنەکانیان، کە لە خێزانی دایبابی ئاسایین.(١)

لە لایەکـــی تـــرەوە، تـــوێژینەوەیەکی پـــێگەداری زانکـــۆی (تەکســـــاس) لە (ئۆســـــتن)دا دەریخســـــتووە، کە منـــــداڵی هاوڕەگەزبـــازان، ئەگەری تووشـــبوونیان بە کۆمەڵێـــک گرفتـــی سۆزداری و کۆمەڵایەتی زیاترە. بەپێی تـوێژینەوەکە، بەراوردێـک لە نێوان منداڵی خێزانی هاوڕەگەز و منداڵی خێزانی ئاساییدا کراوە و بەپێی ٨٠ پێوەر دەرکەوتووە، کە ڕۆڵی منـداڵی هاوڕەگەزبـازان، لە ٧٧ پێوەردا خراپتر بووە لە منداڵی خێزانی ئاسایی.(٢)

لە هەمــان بابەتــدا، تــوێژەر (پــۆڵ ســۆلینز) بەراوردی چەنــد لایەنێکی منداڵی هاوڕەگەزبازان و منداڵی خێزانی ئاسایی کـردووە و بـــۆی دەرکەوتـــووە، کە مەترســـیی تووشـــبوون بە خەمـــۆکی لە قۆناغی بـاڵغبوون لە لای منـداڵی هاوڕەگەزبـازان، دوو ئەوەنـدەی منداڵی خێزانی ئاساییە؛ هەروەها بـۆی دەرکەوتـووە، کە مەترسـیی بیرکـردنەوە لە خۆکوشـتن لە لای منـداڵی هاوڕەگەزبـازان، پێـنج ئەوەندەی ئەوانیترە.(٣)

---

(1) New Patterns of poverty in the Lesbian, Gay, and Bisexual Community: https://shorturl.at/bdlqv

(2) Potter D. 2012. "Samw-Sex parent Families and Children's Academic Achievement." Journal of Marriage and family 74: 556-571

(3) Regnerus M. 2012. How different are the adult children of parents who have same-sex relationships? Findings from the New family Structures Study. Social Science Research 41: 752-70.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی ڕێژەی قەڵەوی و کۆژان و گرفتە سۆزدارییەکانیان چەند ئەوەندەی منداڵی دوو ڕەگەزەکەیە. ئێمە لەبەردەم مەودایەکی گەورەی کۆژاندایین، کە سێ لایەنی گرتووەتەوە: دایباب و منداڵ، توندوتیژیی خێزانی، بەرزیی ڕێژەی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان و ماددە کحولییەکان و خۆکوشتن و خەمۆکی و لەدەستدانی ئارەزووی خواردن و هەژانە دەروونییەکان.

هەموو ئەوانە پرسگەلێکن، کە بناغەی خێزان هەڵدەتەکێنن و تەندروستیی هزری و دەروونی و جەستەیی خێزانە هاوڕەگەزەکان وێران دەکەن.

کەواتە، کەی ئەو منداڵانە و خێزانەکانیان ڕزگاریان دەبێت؟

## جێندەر: قەیرانی مرۆڤی سەردەم

چەمکەکانی ژیانی سێکسی، هەروەک زانای کۆمەڵناس (ئەنتۆنی گیدنەر) لە کتێبەکەیدا باسی دەکات: (چەندین گۆڕانکاریی گەورەیان بەسەردا هاتووە. کرۆکی لایەنە گرنگەکانی ژیانی خەڵک لە ڕووی سێکسییەوە لە وڵاتە خۆرئاواییەکاندا لە ماوەی چەند دەیەیەکدا گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە. چالاکیی سێکسی لەم ڕۆژگارەدا ڕەهەندێکی جیاوازی هەیە، کە تاک دەیەوێت بە دوایدا وێڵ بێت و ئەنجامی بدات، لە کاتێکدا ژیانی سێکسی بەوە ناسراوە، کە پەیوەندیدارە بە ڕەگەزی بەرانبەرەوە و لە چوارچێوەی ژیانی هاوسەریدا دەبینرێت، بەڵام ئەم چەمکە لەم ڕۆژگارەدا چەندین ڕەفتار و شێواز و ئاراستەی سێکسیی تری هەیە لە وێنە و شێوازی جیاواز و جۆراوجۆردا).

چەمکی جێندەر ڕۆڵێکی سەرەکیی گێڕاوە لە دەرکەوتن و پەرەسەندنی ڕەفتار و ئاراستە سێکسییە نوێیەکاندا، گوزارشتەکانی وەک (ڕۆڵی ڕەگەزی Gender Role)، یان (ناسنامەی ڕەگەزی Gender Identity) لە واقیعدا نوێن، ئەگەرچی هەندێ کات تەنیا وەک کلێشە دەردەکەون، هەروەک (دەیڤید گلافەر) و (کۆراکابلان) باسیان لێوە کردووە.

چەمکگەلێکی لەم شێوەیە بەر لە دووەم جەنگی جیهانی

بوونیـــان نەبـــوو، تەنـــانەت دەســـتەواژە نزیکەکـــانی وەک (دوانە ڕەگەزی Gender-Bender)یـــش، تـــا ســـەرەتای هەشـــتاکان دەرنەکەوت.

پێـــوەرە ڕەگەزییەکـــان، بەپێـــی قســـەی گـــلافەر و کـــابلان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا وردە وردە وەک باسـێکی مەعریفیـی زانستی و گشتی دەرکەوتن.

واتـــا نـــوێیە تـــازە پەیـــدابووەکان، ســـێکس و جێنـــدەریان وەک ئاماژەیەکی بەهێز لەســـەر فراوانکـــردنی ئـــازادییە تاکەکەسـییەکان لەســـەر حســـابی کـــۆمەڵگە بەکارهێنـــا، هەروەهـــا لەســـە ر ئاســـتی گرنگیدان بە سێکس و ژیانی سێکسی.

## جێندەر: مێژوو و بەڵگەکان

کۆمەڵناسـان چەمکـی ڕەگەز (Sex) وەک ئامـاژەکردن بـۆ جیـاوازییە شـیکاری و فیسـیۆلۆجییەکانی نێـوان نێـر و مـێ بەکاردەهێنن. هەرچی جێندەر (جۆر/ ڕەگەزایەتی)یە، واتای هـزر و بیرۆکە و دیدی کـۆمەڵایەتی و ڕۆشـنبیرییە بـۆ واتـای پیـاوەتی و ژنێتی. مەبەست لە جێنـدەر ڕەتکـردنەوەی جیـاوازی ڕۆشـنبیری و کـۆمەڵایەتیی نێـوان هەردوو ڕەگەزەکەیە، بەوپێـیەی پێویسـتە بـڵاوی و پەیڕەویکـردن لەم چەمـکە ببێـتە هـۆی پێکهێنـانی ڕۆشنبیرییەکی نـوێ لە کۆمەڵگەیەکـدا، کە نێرینەیـی و مێینەیـی تەنیا وەک جیاوازی بایۆلۆجی سەیر دەکات و لە دیدی ئەودا هـیچ جیاوازییەکی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و پیشەییان نییە. هەرکات ئەم کلتـووره گـۆڕا ئەوکـات چەمکـی نێرینەیـی و مێینەیـیش لەگەڵیدا دەگۆڕێت.[1]

ئەو قسـانە ئەم هاوکێشـەیە پێکـدەهێنن: پیـاو لەبەر ئەوە پیـاو نییە، کە بەم جۆرە بەدیهاتووە، ئافرەتیش لەبەر ئەوە ئـافرەت نیـیە، کە بەم جۆرە بەدیهاتووە، بەڵکو لایەنی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و دامەزراوەیی بیرۆکەکان و بۆچوونە گشتییەکان وا لە پیـاو دەکەن

---

[1] مجلة الاستغراب، العدد ١٦، ص ١٧٢

پیاو بێت و وا لە ئـافرەت دەکەن ئـافرەت بێـت؛ کەوایە ناسـنامەی ڕەگەزی، مەرج نییە بەرهەمی ڕاستەوخۆی لایەنی بایۆلۆجی بێـت، بەڵکو ئەوەیە، کە خۆی چۆن خۆی دەبینێت. بەپێی لۆژیکی جێندەر دەکرێت مرۆڤ بە نێـر لەدایـک ببێـت، بەڵام ناسـنامەی ڕەگەزی و کۆمەڵایەتیی مێ بێت، یان بەپێچەوانەوە.

ئەم قسانە واتە چی؟! واتە جۆرە بایۆلۆجییەکەت پەیوەنـدیی بە خواستە سێکسییەکەتەوە نییە و سەپێنراویی جـۆرێکی بـایۆلۆجی بەسەرتدا واتای ئەوە نییە، کە ناچاربیت قەبـووڵی بکەیـت، بەڵکـو هەرکات ویستت دەتوانیت بیگۆڕیت.

ئەوەی لەم باســـەدا جێـــی ســـەرنجە ئەوەیە، کە ناوەنـــدی ڕۆشنبیریی خۆرئاوایی - کە بزووتنەوەی جێنـدەری تێـدا لەدایـک بـووە و بـووەتە ڕەوتێکـی تونـدڕەو - هێشـتا چەنـدین نـاڕوونی و ناسـەقامگیری لە لێکـدانەوە و تەفسـیر و بەکارهێنـانی چەمکـی جێنـدەردا هەن، بەڵام خـاڵی هاوبەشـی نێـوان پێناسـەکانی جێنـدەر ئەوەیە، کە تەسلیمبوون بە نێرینەیی و مێیینەیـی لەجەسـتەدا ڕەت دەکەنەوە.(١)

## سیاسەتی زۆرەملێی جێندەر:

ئایدۆلۆجیای جێندەر لە پشت ئەو ڕاستییەوە خۆی حەشارداوە، کە ئێمە بە نێر، یان مێ لەدایک دەبین، بەڵکو لەبری ئەوە بانگەشە بۆ ئەوە دەکات، کە دەکرێت منداڵ لە جەستەیەکی هەڵەدا لەدایک ببێت! ئەو بیرۆکە تاریک و ڕووخێنەرانە هەر لە بچووکییەوە لە ڕێی پرۆگرامەکانی خوێندنەوە لە باخچە و خوێندنگەکاندا، یان لە ڕێی فیلم و دراما و بەرنامەکانەوە ئاراستەی منداڵان دەکرێن.

ئەوەتا لەم دواییانە کۆمپانیای دیزنی ڕایگەیاندووە، کە ٥٠%ی بەرنامەکانی بۆ پشتگیریکردن و بەرەودان بە هاوڕەگەزبازی و ئاراستە سێکسییەکانی تر دەبێت. لە قوتابخانە، یان لە ڕێی تەلەفزیۆن و پرۆگرامە کۆمەڵایەتییەکان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا، منداڵ فێری ئەوە دەکرێت، کە جەستەی کەسێک ئاماژە نییە بۆ ئەوەی نێرە، یان مێ، بەڵکو ناسنامەی ڕەگەزییان بەندە لەسەر هەستکردنیان بەوەی خۆیان کامیانیان دەوێت!

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ٢٠٢٠دا، پەیمانگای (CIVITAS) بۆ توێژینەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی کتێبێکی بڵاوکردەوە بە ناونیشانی: (کاریگەریی وێرانکەری ئایدۆلۆجیای گۆڕینی ڕەگەز The Corrosive Import of Transgender)، کتێبەکە تیشک

دەخاتە سەر تاریکی و هەڕەمەکێتی ئایدۆلۆجیای جێندەر و گۆڕینی ڕەگەز، چەندین توێژینەوەی زانستییش وەک بەڵگە دەخاتەڕوو.

ژنە توێژەر، نووسەری کتێبەکە (جوانا ویلیامز Joanna Williams) باس لەوە دەکات، کە لە نێوان سالانی (٢٠٠٩ - ٢٠١٠)دا (٣٢) کچ و (٤٠) کوڕ نێردراونەتە سەنتەری دیاریکردن و پەرەپێدانی ناسنامەی جێندەری، بەڵام ڕێژەی نێوان دوو ڕەگەزەکە زیادی کرد و مەودای نێوانیان لەو کاتەوە ساڵ لە دوای ساڵ زیادی کردووە. تێکڕای ژمارەی ناردن بۆ سەنتەرەکانی ناسنامەی جێندەری لە سالانی (٢٠١٩/٢٠١٨)دا تەنیا لە بەریتانیا گەیشتە (٦٢٤) کوڕ و (١٧٤٠) کچ، واتە: لە ماوەی کەمتر لە دەیەیەک زیادبوونێکی سەرسووڕهێنەر بە ڕێژەی ١٤٦٠% لە ژمارەی کوڕان و ٥٣٣٧% لە ژمارەی کچە نێردراوەکان بۆ سەنتەرەکانی دیاریکردن و پەرەپێدانی ناسنامەی جێندەری زیادی کردووە.[١]

ئەو زیادانە بەدرێژایی چەندین ساڵ زیادکراون، لە ڕێی پەیڕەویکردن لە سیاسەتی جێندەریی ناچاری لە قوتابخانە و باخچە و بالاخانە حکومییەکان و ئاودەستە گشتییەکاندا، لە ڕێی

(1) The Corrosive Import of Transgender Ideology, Joanna Williams, Civitas 2020, p:20

پاڵپشتیی ڕاگەیاندنی ئاراستەکراوەوە. هەموو ئەمانە کاریگەرییان بەسەر خەیاڵدانی کۆمەڵگە و بیرۆکەکانی منداڵ و تێڕوانینی بۆ جەستە و ماهییەت و حەقیقەتەکەی و واتای نێرینەیی و مێینەیی جێدەهێڵن.

سکۆتلەندا یەکێکە لەو وڵاتانەی سیاسەتی جێندەری بێلایەنانە پەیڕەو دەکات، کە دان بە جیاوازییە بایۆلۆجی و سرووشتییەکانی نێوان هەردوو ڕەگەزدا نانێت و لە باخچە و قوتابخانەکاندا پەیڕەوی دەکات. وەزارەتی فێرکردن لە ٢٤ی ئەیلوولی ٢٠٢٠دا گشتاندنێکی بۆ قوتابخانەکان کردووە، کە بەپێی یاسا منداڵان لە تەمەنی چوار ساڵییەوە مافی ئەوەیان هەیە ناو و جێناوی گونجاو بۆ ڕەگەزە بایۆلۆجییەکەیان هەڵبژێرن، بەبێ ئەوەی پێویستییان بە ڕەزامەندیی باوک و دایک هەبێت، واتە: کچۆڵەیەک دەتوانێت داوا لە کارگێڕیی قوتابخانە و مامۆستا و فێرخوازان بکات، کە بە جێناوی (نێرینە)، یان بە ناوێکی (نێرینە)وە بانگی بکەن و پێویستە هەموویان ڕێز لەو بڕیارەی بگرن و هەرکەس جێبەجێی نەکات ڕووبەڕووی یاسا دەکرێتەوە.[1] هەروەها بڕیارەکە هانی قوتابخانەکان دەدات، کە لە کتێبە مەنهەجییەکانی خوێندندا وێنە و بۆچوونی ڕەگەزگۆڕاوەکان نیشان بدرێت. هەروەتر بیر لەوە

---

[1] (Scottish four-year-olds can change gender at school without parents' consent): http://bit.ly/3zYkmBO

دەکەنەوە، کە یەکپۆشی بۆ هەموو فێرخوازانی نێر و مێ، وەکو یەک لە قوتابخانەکاندا پەیڕەو بکەن."(١)

ژنە بەڕێوەبەری بەشدار لە ڕێکخراوی (لەپێناو ژناندا For Women)ی سکۆتلەندی (ماریۆن کاڵدەر Marion Calder) ڕێنماییە نوێیەکانی حکومەتی بە جێی دڵەڕاوکێ وەسف کردووە، هەروەها وتوویەتی: (ئەوەی ئایدۆلۆجیای حکومەتی سکۆتلەندی برەوی پێ دەدات مەترسیدارە. لە ئێستادا منداڵان هان دەدرێن، کە شوێن ڕێڕەوێکی پزیشکی بکەون بۆ گۆڕینی ڕەگەزیان، بەڵام پێویست ناکات منداڵان فێربکرێن، کە دەتوانن ڕەگەزەکەیان بگۆڕن؛ بەتایبەت ئەوانەی لە قۆناغی سەرەتاییدان، چونکە ئەمە مەحاڵە، کەس ناتوانێت ڕەگەزەکەی بگۆڕێت).(٢)

لە هەمان باسدا، (شیرین بنیامین Shereen Binjamin) گەورە وتاربێژی فێرکردنی سەرەتایی لە زانکۆی (ئەدنبرە Edinburgh university) نووسیویەتی: (فێرکردنی منداڵان و ئامادەکردن بۆ ئەوەی دەکرێت لە جەستەی هەڵەدا لەدایک بووبێتن، گومڕاکردن و دواکەوتووییە و دەکرێت زۆریش زیانبەخش بێت).(٣)

---

(1) Children as young as for in Scotland are allowed to change gender at school without parent's consent: http://shorturl.at/biKRZ

(2) Scottish four-year-olds can change gender at schppl without parent's consent.

(3) (Government issues gender identity guidance for teachers in England): https://bit.ly/3d5Sh2O

بەم شــێوەیە بــرەو بە ئایــدۆلۆجیای جێنــدەر و بڵاوکــردنەوەی گوتاری گـۆڕینی ڕەگەزی دەدرێـت لە بـاخچە و قوتابخانەکانـدا و منداڵان بە ئامانج دەگرن بۆ گۆڕینی یاساکان. لە سـوید و کەنەدا و هەندێک ویلایەتی ئەمریکادا سیاسەتی بەکارهێنانی جێناوی (نێر، مــێ) قەدەغەیە و بەســـەر مامۆســـتایاندا دەســـەپێنرێت، وەک وشەکانی کـوڕان، کچـان و... هتـد، لەبـری ئەوانە دەبێـت وشـەی گشتی بەکاربێنن وەک: هاوڕێکان، دۆستان، کەسەکان.

## مەترسیی جێندەر:

ئەو نـاڕوونییەی لە چەمکــی جێنــدەردا هەیە، وای کـردووە لە خـزمەت هەمــوو جـۆرە داواکارییەکــدا بێــت. وەک چەتــرێکە کۆمەڵێــک چــالاکوان لە ژێریــدا کۆبــوونەتەوە، کە ئامــانجی هاوشێوە، یـان خـاڵی هاوبەشـیان هەیە: فێمێنیسـتەکان گرنگـی بە یەکســانیی نێــوان پیــاو و ژن دەدەن، لادەر و هاوڕەگەزبازەکــان خەمی چەسپاندنی مافە سێکسییەکانیانە، چالاکوانەکـان پاڵپشـتی لە گۆڕینی ڕەگەز و سێکسی ئـازاد دەکەن و دژایەتیـی بیـرۆکەی (دوو ڕەگەزەکە) دەکەن.

ئەو نــاڕوونی و پەرتەوازەیــیەی، کە ئەم چەمــکە لەســەری دامەزراوە، لـێکەوتەی زۆر گەورە و خراپــی دەبێــت بـۆ گـۆڕینی کلتــوور و ڕەوشــت، چــونکە گــریمانەی نەبــوونی جیــاوازییە بایۆلۆجییەکان ئەو ڕۆڵە بایۆلۆجییانە دیاری دەکـات، کە هەریەک لە پیاو و ئـافرەت پێـی هەڵدەسـتن و بەسـەر خواسـت و ئـارەزووە سێکسییەکاندا جێبەجێ دەبێت؛ بەجۆرێک ناتوانرێـت – سـەبارەت بە جێندەر – بوترێت، کە مـێ مەیلێکـی فیتریـی بـۆ نێـر هەیە و بە پێچەوانەیشەوە، بەڵکو پێویستە ئەو مەیلە بۆ هەمان ئاراستە بێت، واتە: مێ بۆ مێ و نێر بۆ نێر.[١]

---

[١] مجلة الاستغراب، العدد ١٦، إيدولوجيا الجندر، ص ١٧٥

لەسەر ئەم بۆچوونە تیۆرییە بنچینەییە، زنجیرەیەک کارلێک و ڕەفتار دێنە کایەوە، کە بە هیچ جۆرێک جڵەوگیر ناکرێن و دەرگا بە ڕووی چەندین بژاردە و ئەگەردا واڵا دەکەن، کە سنووردار ناکرێن، چونکە مێینەیی و نێرینەیی دەکرێنە جۆرێکی داماڵراو لە هەر سیفەتێکی پێشوەختە؛ لەبەر ئەوەی بەپێی لۆژیکی جێندەر بایۆلۆجیا بە ڕوونی و ڕاشکاوی و نەگۆڕیی خۆیەوە، بۆی نییە سیفەتی کۆمەڵایەتی و ناسنامەی ڕەگەزی دیاری بکات.

ئەم دۆخە فشار دەخاتە سەر لایەنەکانی یاسادانان و داوایان لێ دەکات دووبارە پێناسەی هاوسەرگیری و خێزان و نزیکایەتی و بەرپرسیارییەت و میرات و مافەکانی دایک و باوک و منداڵ دابڕێژنەوە، ئەمەیش وا لە چەمکەکان دەکات ئەگەری زیاتر هەڵبگرن و ئازادیی تاکەکەسی زیاتر - تەنانەت ئەگەر لادەرانەیش بێت - لەسەر حسابی کۆمەڵگە و بەها ڕەوشتییەکان فەراهەم بکەن. بەم جۆرە پێناسەکان لادەبرێن، یان بێواتا دەمێننەوە؛ هاوسەرگیری بە هاوسەرگیری نامێنێتەوە، خێزان بە خێزان نامێنێتەوە، دایکایەتی و باوکایەتی واتا چەسپاوەکەیان بەدرێژایی مێژوو لەدەست دەدەن، کۆمەڵگە و مرۆڤیش بێهیوا دەبن لە مانەوەیان لەسەر فیترەت و یاسا سروشتییەکان.[1]

---

[1] أيديولوجيا جندرية، أنثى، أم ذكر، أم أخرى: https://bit.ly/3Ghciwb

تـا ئێـرە، هێشـتا قسـەمان لەسـەر تونـدوتیژی و تاوانکـاری و نایەکسـانیی یاسـا و کـۆمەڵایەتی و مـافپەروەری نەکـردووە، کە جێنـدەر دەیسـەپێنێت. گـریمان پیاوێـک پەڕاوێکـی یاسـایی وەردەگرێت، کە پێی دەڵێن ژنە، ئەوکات لە یـاری و پێشـبڕکێکاندا لەگەڵ ژنـان کێبڕکـێ دەکـات، حەمـام و ژووری جلگـۆڕین و مەلەوانگەی تایبەت بە ژنـان بەکاردەهێنێـت، هەروەهـا لە ئەگەری ئەنجامدانی تاوانێکیشدا لە زیندانی ژنان زیندانی دەکرێت.

ئەوسـا هەواڵێـک دەخـوێنیتەوە وەک: ڕەگەزگـۆڕێکی زیندانیکراو لە زیندانی ژنانـدا تۆمەتبـارە بە ئەنجامـدانی چەنـدین تاوانی سێکسی لەنێو زینداندا، هەروەها دەستدرێژیی کردۆتە سەر دوو ئافرەت.[١]

یان لە قوتابخانەکاندا، کاتێک هەرزەکارێکی پـانزە سـاڵان، کە خـۆی بە کـچ لە قەڵەمـداوە، لە حەمـامی کچانـدا دەسـتدرێژیی کـردووەتە سـەر دوو کـچە فێرخـواز.[٢] ئەوەی جێگـای تێڕامـانە ئەوەیە، کە دایکـی هەرزەکـارەکە لە دیمانەیەکـی ڕۆژنامەوانیـدا ئەوەی ڕاگەیاندووە، کە کـوڕە تۆمەتبـارەکەی بە دەسـتدرێژیکردنە

---

(1) Trangender prisoner who sexually assaulted inmates jailed for life | prisons and probation | The Guardian: https://shorturl.at/ceWZI

(2) Loudoun Country and the cruelty of tarns ideology: https://shorturl.at/bdefV

سەر دوو کچەکە، ڕەگەزی خۆی نەگۆڕیوە، تەنیا هەندێ کات ئارەزووی لە پۆشینی تەنوورە کردووە.[1]

لێرەدا پرسیارێک دروست دەبێت، کێ مافی بە زیندانییەکە و هەرزەکارەکە داوە بڕواتە ژووری زیندانی و حەمامی کچانەوە؟ کێ بڕیاریداوە، کە ئەوان سەر بە ڕەگەزێکی ترن؟ کێ بەرپرسە لەو تاوان و دەستدرێژییانە؟ دەبێت کێ بەرپرس بێت و لەسەر ئەو ناهەمواریيە لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێت؟!

[1] Shorturl.at/aiJ45, Mother of Loudoun country Bathroom Rapist Blames Vicim: 'You're 15. You Can Reasonably Defend Yourself'

## کۆمەڵگەیەک، کە گوێ بە مانەوە نادات:

ئەو پەیوەستییەی ئێستا بە جێندەرەوە و چاوپۆشیکردن لە کەموکوڕی و خراپەکانی و لێکەوتە وێرانکەر و تێکدەرەکانی، ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ ئەوەی، کە یەکەمین جارە لە مێژوودا، کۆمەڵگەیەک هەبێت سڵ لە گاڵتەکردن بە بوونەوەرانی خودا و گۆڕینی سروشتی مرۆڤایەتی نەکاتەوە و گوێ بە مانەوە و لادان لە فیترەت و بێڕەوشتی نەدات.

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ (الروم: ٣)

واتە: "دەی ڕووی خۆت ڕاست بکە بۆ ئایینی ئیسلام بە حاڵێکی وا، کە لابدەیت لە هەموو کارێکی بەتاڵ، لەسەر ئەو فیترەتە پاکەی خودا مەخلووقی لەسەر درووست کردووە. کەس ناتوانێت ئەوەی خوا کردی بیگۆڕێت. ئەمەیە ئایینی ڕاست، بەڵام بەشی زۆری خەڵک نازانن".

# ڕەگەزگۆڕین و کوشتنی مرۆڤایەتی

لە ڕاپۆرتێکی وێنەییدا، کە کەناڵی SKY Newsی بەریتانی بە ناونیشانی: (سەدان گەنجی ڕەگەزگۆڕاو داوای یارمەتی دەکەن، تا بگەڕێنەوە سەر ڕەگەزە ڕەسەنەکەیان)[1] زۆر شت باس کراوە؛ ڕۆبی، کە لە تەمەنی سیانزە ساڵییەوە وەک نێر ناسێنراوە، ئێستا تەمەنی بیست و یەک ساڵە، پێشتر دەیویست نەشتەرگەریی لابردنی مەمکەکانی بکات؛ بۆ ئەوەی کرداری بوون بە نێرینەیی تەواوتر بێت، بەڵام بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ ڕەگەزە ڕاستەقینەکەی و نەشتەرگەرییەکەی وەستاند و وازی لە وەرگرتنی هۆرمۆنی نێرینە (تێستۆستیرۆن) هێنا.

ئامارێکی ورد نییە، کە ڕێژەی ئەوانە دیاری بکات لە کۆمەڵگە خۆرئاواییەکاندا بەدەست ناسەقامگیریی ناسنامەی ڕەگەزییەوە دەناڵێنن GENDER IDENTITY DISORDER، بەڵام ڕێژەیەکی بەرچاو بوونیان هەیە.

ڕاپۆرتێک، کە لە پەیمانگای (Williams) بۆ توێژینەوە لە ئاراستەی سێکسی و ناسنامەی ڕەگەزی لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە ساڵی ٢٠١٦دا بڵاوکراوەتەوە، دەریخستووە ژمارەی

[1] 'Hundreds' of young trans people seeking help to return to original sex: https://shorturl.at/dJKMY

ڕەگەزگۆڕاوەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دەگاتە ملیۆنێـک و چوارسەد هەزار کەس.[1]

ناسـەقامگیریی ناسـنامەی ڕەگەزی چیـیە؟ ڕەگەزگۆڕاوەکـان کێن؟ بـۆچی هاوشـێوەی هاوڕەگەزبـازان لە ڕێـبەری دیـاریکردنی نەخۆشـــییە دەروونییەکانـــدا ســـڕانەوە؟ بـــۆچی هەنـــدێک لە هاوڕەگەزبازان بە بوون و مافەکانی ئەوان ڕازی نین؟

[1] https://williamsinstitute.law.ucla.edu/publications/trans-adults-united-ststes/

## ناسەقامگیریی ناسنامەی ڕەگەزی:

لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا، چەمکی (جێندەر) یان (جۆری کۆمەڵایەتی) هاتەکایەوە، بۆ جیاکردنەوەی لە جۆری بایۆلۆجی (ڕەگەز)، هەروەک لە تەوەرەی ڕابردوودا باسمان کرد.

لەو ماوەیەدا، هەر کەموکوڕییەک لە نێوان ڕەگەز و جێندەردا دەخرایە ژێر چەتری نەخۆشییە دەروونییەکانەوە، ژمارەی سێیەم لە ساڵی ١٩٨٠ و ژمارەی چوارەم لە ساڵی ١٩٩٤ لە ڕێبەری دیاریکردن و ئاماری نەخۆشییە دەروونییەکان (DSM)، چەمکی (ناسەقامگیری/ کەموکوڕیی ناسنامەی ڕەگەزیی وەک چەترێک بەکارهێنا، کە لە ژێریدا هەژانە دەروونییەکان لەهەمبەر ناسنامەی ڕەگەزی کەسەکەدا کۆدەبوونەوە.

دواتر، لە نوێترین ژمارەیدا، فەرمانەکە دەستکاری کرا. لە ژمارەی پێنجەمیدا، کە لە ساڵی ٢٠١٣دا دەرچوو، چەمکی (ڕازی نەبوون لە ناسنامەی ڕەگەزی Gender dysphoria)[١] گۆڕانکاریی بەسەردا هات و چەند شتێکی تێدا سڕانەوە و وشەی گونجاوتریان لە شوێنیان دانرا. وشەی هەژان/ ناسەقامگیری

---

[1] The history of the concept of gender identity disorder: https://shorturl.at/AQSW9

گۆڕدرا بۆ (ڕەزامەندی Dysphoria)، لادان بۆ جیاوازی، ڕیزپەڕی سێکسی بۆ خواست و... هتد. ئەو وشانە، نەک هەر یەکانگیرترن لەگەڵ چەمکەکانی زانستی ڕەگەزناسیدا، بەڵکو هەر لەبنەڕەتدا ئەوە ڕەت دەکەنەوە، کە نەخۆشەکە هەژان و گرفتی دەروونیی هەیە.

دوای ئەوەی ناسەقامگیریی ناسنامەی ڕەگەزی، نەخۆشییەکی دەروونی بوو و چارەسەری هەبوو، کەچی ئێستا ڕۆڵی پزیشکی دەروونی بووەتە دڵنیابوونەوە لەوەی ئاخۆ کەسە نارازییەکە لە ڕەگەزە بایۆلۆجییەکەی، هیچ نەخۆشییەکی تری دەروونیی هەیە[1]، کە تووشی هەژانی ناسنامەی ڕەگەزیی کردووە؟ وەک: سایکۆس و شیزۆفرینیا و ناسەقامگیریی ناسنامەی کەسی، یان ناسەقامگیریی کەسایەتی (فرەکەسایەتی) و ئۆتیزم و ناسەقامگیریی شێواوی جەستە و نەخۆشییەکانی تر...

بەڵام هەموو ئەو هەوڵ و ئازارە لەپای چی؟! گۆڕینی چەمکە پزیشکییەکان بە چەمکی تری نوێ و گاڵتەکردن بە ناسنامە بایۆلۆجییەکەی مرۆڤ بۆچی؟! بۆچی هاوشێوەی مامەڵەکردنیان لەگەڵ هاوڕەگەزبازی (Homosexuality)، مامەڵە لەگەڵ ناسەقامگیریی ناسنامەی ڕەگەزییشدا ناکەن و یەکجاری لە

---

(1) Gender Dysphoria in Adults: An Overview and primer for psychiatrists: thhps://shorturl.at/aqtV6

ڕێبەری دیاریکردن و ئاماری هەژانە دەروونییەکاندا دەرینـاهێنن؟ یان نهێنیگەلێک لە پشت هێشتنەوەیدا هەن لە دوو توێی سەرچاوە پزیشکییەکاندا، بۆیە وەک هاوڕەگەزبازی بەیەکجاری نایسڕنەوە؟

## باجدان:

چارەسەری پزیشکی بۆ کەسی ڕەگەزگۆڕ بە چەنـد قۆناغێکـدا تێدەپەڕێت، سەرەتا هەڵسەنگاندن و دیاریکردن، پاشان چارەسـەری دەروونی، یان ڕاوێژکاری؛ پاشـان ئەزمـوونی واقیعـی (RLE)، کە قۆنـاغێکە تێیـدا کەسـەکە ژیـان بەتەواوەتـی لە ڕۆڵـی ڕەگەزی خوازیاری خۆی تاقی دەکاتەوە، بەر لەوەی چارەسـەری جەسـتەیی وەربگرێت، کە بواری پەشیمان بوونەوەی نییە، پاشـان چارەسـەری هۆرمـۆنی و لەکۆتاییشـدا چارەسـەری نەشـتەرگەری (کە لادانی ئەندامەکانی زاوزێی کۆن و دانانی ئەندامی نوێ دەگرێتەوە).[١]

کـارەکە لێـرەدا ناوەسـتێت، دوای نەشـتەرگەری، کەسـی ڕەگەزگۆڕاو لە ژێر چاودێرییەکی پزیشکیی چڕدا دەبێت، لە ترسـی ئەوەی تووشی شێرپەنجەی قۆڵۆن؛ یان سییەکان، یـان مەمکەکـان نەبێت، یان گورچیلە و جگەری لەکار نەکەوێت.[٢]

---

[1] Transgender Care in the primary Care Setting: A Review of Guidelines and Literature: https://shorturl.at/nvzl7

[٢] سەرچاوەی پێشوو.

هەرچی باسی خەرجیی ماددیی نەشتەرگەرییەکەیە، ئەوا بەپێی حاڵەتەکە دەگۆڕێت، بەڵام لە هەر دۆخێکدا بێت باس لە ژمارەی گەورە دەکەین، بەپێی داتاکانی پێگەی (Cost Helper)ی ئەمریکی خەرجییەکەی دەگاتە سەد هەزار دۆلار و زیاتریش.[1]

### دەپرسین: کێ ئەم خەرجییە لە ئەستۆ دەگرێت؟

بەپێی کۆمەڵەی ئەمریکیی بۆ پزیشکیی دەروونی APA، هەرکات پرسەکە پەیوەست بێت بە چاودێریی پزیشکییەوە، ئەوا چەندین بژاردەی چارەسەر لە بەردەم کەسی ڕەگەزگۆڕاودا هەیە، کە ڕاوێژکاری پزیشکی و چارەسەر لە ڕێی هۆرمۆن و نەشتەرگەریی گۆڕینی ڕەگەز و ڕاگوزەری کۆمەڵایەتی و یاسایی ڕەگەزی داواکراویش لەخۆدەگرێت. جا بۆ دەستکەوتنی دەستەبەری پزیشکی، پێویستیت بە دیاریکردنی پزیشکی هەیە. پێشتر دوودڵییەک هەبوو لەهەمبەر دەرهێنانی دیاریکردن (تشخیص)ی پزیشکی لە ڕێبەری دیاریکردن و ئاماری نەخۆشییە دەروونییەکان، کە ئەگەر ڕوویدات، دەبێتە ڕێگر لە بەردەم وەرگرتنی مافی چاودێریی پزیشکی خۆڕایی بۆ ڕەگەزگۆڕاوەکان.[2]

---

[1] How Much Does Sex Reassignment Surgery Cost? https://shorturl.at/nQVZ3

[2] APA_DSM-5-Gender-Dysphoria.pdf https://shorturl.at/djkQS

کەواتە، وا دیـارە پێویسـتییان بە کەسـانێک، کە خەرجیـیەکە لەئەستۆ بگـرن، هۆکـارە بـۆ هێشـتنەوەی ئەو دیـاریکردنە، بەهـۆی تێچووی بەرزی ئەو کردارەوە. لیستی سەرەنووسین و چـاوەڕوانی ئەو خزمەتگـوزارییە خـۆڕاییە، کە کەسـانی تـر بـاجەکەی دەدەن، زۆرە. هەمـــــوو ئەو هۆکـــــارانە – بە ڕۆڵـــــی فشـــــارکردنی کۆمەڵەکانیشـــــەوە – وا دەکـــات بەخێرایـــی پەنـــا ببرێـــتە بەر نەشـــتەرگەری، یـــان ڕازیبـــوون بە بارودۆخەکـــان بەبـــێ بـــوونی بەندوبارە پێویستەکان.

لە ئۆکتـــۆبەری ســـاڵی ٢٠١٩دا، پرۆگرامـــی (٦٠ خـــولەك 60Minutes)ی ئوسـتـرالی لە یەکێـک لە ئەڵقەکانیـدا بـاس لە بارودۆخی کوڕە هەرزەکارێک دەکات بە ناوی پاتریـک، کە وەک کـچ ناسـێنراوە، گەشـتی چارەسـەرکردنی سـەرەتا بە چارەسـەری هۆرمـۆنی دەسـت پـێ دەکـات، پاشـان نەشـتەرگەریی چانـدنی مەمکەکـانی بـۆ دەکرێـت.. بەڵام دواتـر کـوڕەکە داوا دەکـات بگەڕێـتەوە سـەر ڕەگەزە ڕاسـتەقینەکەی، دووبـارە لە ڕێـی نەشتەرگەرییەوە مەمکەکانی لادەبرێنەوە.[1] لە وەڵامی ئەوەی لێی دەپرسن ئاخۆ پزیشکەکان لە دیاریکردندا هەڵەیان کردووە؟ پاتریک دەڵێت: "نەخێر، ئەوکات خۆم ئەوەم ویست".

---

[1] Trasgender boy transitioning to life as girl changes his mind | 60 Minutes Austalia: https://shorturl.at/EJOQ5

## پەشیمانییەکی زۆر درەنگ:

پاتریک تاکە حاڵەتی پەشیمانبوونەوە نییە، سەرەڕای بانگەشەی ڕێکخراو و لایەنەکانی داکۆکیکار لە گۆڕینی ڕەگەز، کەچی پەشیمانی و بێهیوایی باڵی بەسەر ڕەگەزگۆڕاوەکاندا کێشاوە، بەڵام بە داتای ئەوان لە ٢% تێپەڕ ناکات! لە کاتێکدا (واڵت هەیەر Walt Heyer)، کە لە ئەپریلی ١٩٨٣دا نەشتەرگەریی گۆڕینی ڕەگەزی بۆکرا، باس لە پەشیمانی و بێهیوایی خۆی و زۆرێک لەوانە دەکات کە ڕەگەزیان گۆڕیوە.[1]

واڵت پێگەیەکی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێتدا دامەزراند بۆ یارمەتیدانی ئەو ڕەگەزگۆڕانەی پەشیمانن، هەروەها وتار پێشکەش دەکات بۆ هۆشیارکردنەوەی خەڵک لە مەترسی گۆڕینی ڕەگەزگۆڕین، بەتایبەتی لەسەر منداڵان. لەمیانی قسەکانیدا دەربارەی ئەوانەی هەستیان بە پەشیمانی کردووە دوای ئەوەی ڕەگەزیان گۆڕیوە، واڵت دەڵێت: "زۆر کەس هەن دوای ئەنجامدانی نەشتەرگەری و گەیشتن بە خاڵی نەگەڕانەوە، هەست بە پەشیمانی دەکەن، دوای ئەوە بە ویستی ئازادانەی خۆت ئەندامی

[1] He Used To Be Trans-Here's What He Wants Everyone To Know: https://shorturl.at/bEIT9

زاوزێت لەدەست دەدەیت و لە نێوان ناسنامەیەکی نوێی نامۆ و ناسنامە ڕەسەنە شێواوەکەتدا ون دەبیت!

هۆرمۆنەکان و نەشتەرگەری ڕوخساری دەرەوەت دەگۆڕن، بەڵام ناتوانن هیچ لە حەقیقەتی نەگۆڕی ڕەگەزدا بگۆڕن، کە دوای چەند ساڵێک هەستی پێ دەکات و ئەوسا نە پەشیمانی سوودی هەیە و نە ڕێگەیەک هەیە بۆ ڕزگاربوون.

(ڕینێ جاکس Rene Jax) لە ڕاپۆرتێکی وێنەییدا بۆ تۆڕی RTی هەواڵی، کە لە مانگی ئەیلوولی ٢٠١٨دا دەربارەی ژیانی سێ کەس، کە نەشتەرگەریی گۆڕینی ڕەگەزیان بۆکراوە، باس لە ئەزموونەکەی لەگەڵ ڕەگەزگۆڕین و پەشیمانبوونەوەی دەکات: (من وەک نێر لەدایک بووم، لە تەمەنی نۆزدە ساڵییەوە وەک کچ دەژیم، لە تەمەنی سی ساڵیشدا نەشتەرگەریی گۆڕینی ڕەگەزەکەم ئەنجامدا. ئێستا بیست و هەشت ساڵ بەسەر ژیانمدا وەک مێ تێدەپەڕێت، زۆر پەشیمانم، نەدەبوو ئەو نیشانەیە بگۆڕم، کە نیشانەی نێرینەییم بوو).

ڕینێ ویستوویەتی ئەزموونی خۆی بۆ کەسانی تر بگوازێتەوە و ڕاستییەکان ئاشکرا بکات، هەر بۆیە هەشت کتێبی لەبارەی ڕەگەزگۆڕینەوە داناوە، لەوانە کتێبی: (سواری فڕۆکەکە مەبە! بۆچی ڕەگەز گۆڕین ژیانت وێران دەکات:

Don’t Get on the plane: Why a Sex Change Will )
(Ruin Your Life

هەروەهـا دەربـارەی کـرداری ڕەگەزگـۆڕین، ڕینـێ دەڵێـت، کە کـرداری شـێواندنی ڕەگەزە و بەهـۆی شکسـتی پزیشـکەکان لە ڕێگریکردن لێی، هەزاران نەخۆش تووشی بوون[١].

کەواتە بۆچی پەشیمانی ڕوودەدات؟ ئایا ئەمە ئارامنەگرتنە؟ یان هۆکاری دەروونی لە پشت پرسەکەوە هەیە؟

پرۆفیسـۆر (جـۆن وایتهـۆڵ John Whitehall) ڕاوێژکـاری تەندروستیی منداڵ لە ئوسترالیا، وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەداتەوە و دەڵێت: "پێویستە دان بەوەدا بنێین، کە ئەو نائارامییەی زۆرێـک لە منـداڵان لەهەمـبەر ناسـنامەی ڕەگەزییـان هەیـانە ،جـۆرێکە لە پەرەسـەندنی سروشـتی لایەنی دەروونیـی منـداڵ و جێـی سەرسوڕمان نییە. ئەوەی جێی دڵخۆشییە ئەوەیە، کە گەشە دەکەن و ئەو نائارامییەیـان نامێنێـت، تەنیـا پێویسـتە گاڵتەیـان پـێ نەکەیت".[٢]

بەپێـی داتاکـانی ناوەنـدی پزیشـکیی (Grace Point) لە ویـلایەتە یەکگرتووەکانـدا، منـداڵەکان لە تەمەنی سـێ بـۆ چـوار ساڵیدا وا بیر دەکەنەوە، کە دەتوانرێت ڕەگەز بگۆڕدرێت؛ هەروەها لە لایان قورسە پەی بە جیاوازیی نێوان جەستەی نێر و مـێ بـبەن،

[١] بۆ وردەکاریی زیاتر: https://shorturl.at/bcqR0

[2] Trasgender boy transitioning to life as girl changes his mind | 60 Minutes Austalia: https://shorturl.at/cpT18, 2:24 – 2:40

بەڵام کـاتێ پێـدەگەن، تێـدەگەن ڕەگەز سـیفەتێکی جێگیـرە و ناگۆڕدرێت.

هەندێکیان وا بیر دەکەنەوە، کە بە گۆڕینی ڕوخسار و ڕووکـار و گرنگیدان و چالاکییەکانیان لە یاریکردندا ڕەگەزیان بـۆ ڕەگەزی بەرانبەر دەگۆڕدرێت.[١]

بەڵام، ئایـا پرسـەکە تەنیـا بە هەسـتکردن بە پەشـیمانی کۆتـایی دێـت؟! لە توێژینەوەیەکـدا، کە ناوەنـدی بەرەنگـاربوونەوەی خۆکوشـتن لە کەنەدا ( CENTRE FOR SUICIDE PREVENTION) ئەنجامیداوە و شوێنی هۆکارەکانی خۆکوشـتن کەوتـووە بەگـوێرەی ئاراسـتەی ڕەگەزی، دەرکەوتـووە ڕێـژەی خۆکوشتن لە لای ڕەگەزگۆڕاوەکان لە بەرزترین ئاستدایە.[٢]

---

(1) Important Report: https://shorturl.at/drtVW
(2) Transgender people and suicide: https://shorturl.at/dEMW5

## لە نێوان LGB و Tدا:

لە دیمانەیەکدا لەگەڵ کەناڵی (Fox News)ی هەواڵیدا، ژنە چالاکوانی هاوڕەگەزباز (جولیا بێک Julia Beck) دەڵێت، کە پیاو و ژنی هاوڕەگەزباز و دوانە ڕەگەزییەکان جیاوازن لە ڕەگەزگۆڕاوەکان. جولیا وای دەبینێت، کە پرسی ڕەگەزگۆڕین پەیوەستە بە ناسنامەی ڕەگەزییەوە، نەک ڕەگەزی بایۆلۆجییەوە وەک هاوڕەگەزباز و دوانە ڕەگەزییەکان، هەر بۆیە ئەوان لەڕاستیدا دوورن لە حەقیقەتی بایۆلۆجیی ڕەگەزەوە.[1] (واتە وای دەبینێت، کە نێر و مێیە هاوڕەگەزبازەکان و دوانە ڕەگەزییەکان بەم جۆرەن، چونکە وەها لەدایکبوون، بەسەریاندا سەپاوە، وەک جین، یان بۆماوەیی) ئەمانە بانگەشەی هەڵەن، هەروەک لە دوو تەوەرەی سەرەتادا باسمان کردن.

باشە، کەواتە جیاوازی هەیە و کۆمەڵگەی ئازادانی سێکس (کویر Queer: چەمکێکی گشتگیرە و ئاماژەیە بۆ ئەوانەی ئاراستەی ڕەگەزی لادەرانەیان هەیە، هاوڕەگەزبازە نێر و مێیەکان و دوانە ڕەگەزییەکان و ڕەگەزگۆڕاوەکان)، بەڵام ئەم کۆمەڵگەیە پڕە لە دابەشبوون و ململانێ، وا دیارە هەندێک لە هاوڕەگەزبازان

(1) Seminist speaks out against trans movement: https://shorturl.at/aEN37

ئاسوودە نین، کە ڕەگەزگۆڕاوەکان لەگەڵیاندا لە ژێر یەک چەتردا کۆببنەوە، بەڵام بۆچی؟ ئایا ئەمە ترسە لە شتێک؟ یان ڕەگەزگۆڕین لێکەوتەی مەترسیداری بەسەر کۆمەڵگەوە هەیە؟

تا ئەمڕۆ، لە یارییەکاندا جیاوازی لەنێوان دوو ڕەگەزەکەدا دەکرێت بە مەبەستی دادپەروەری، چونکە یەکسانی لە بەرژەوەندیی ئافرەت نییە، لەبەر ئەوەی جەستەی پیاو بەهێزترە و ماسوولکەییە و بەهۆی هۆرمۆنی تێستۆستیرۆنەوە نێر توانای بەرگەگرتنی زیاترە. بەڵام با بیهێنینە بەرچاومان چی ڕوودەدات، کاتێک نێرێکی بایۆلۆجی لەسەر کاغەزێکی یاسایی وەک ئافرەت مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، بێگومان لەو حاڵەتەدا دەستە یاساییەکان و تاکەکان ناچار دەکرێن کە وەک مێیەکی سروشتی ڕەفتاری لەگەڵدا بکەن!

ئەمە دامەزراوە وەرزشییەکانیش دەگرێتەوە، ئەی ئەمە ستەم نییە لە مێینە ڕاستەقینەکان دەکرێت، کە کێبڕکێ لەگەڵ مێیەکدا دەکەن لە جەستەی نێردا؟!

سەرباری ئەوەیش، کێبڕکێ وەرزشییەکان تەنیا سەرەتایەکن، ئەی چی دەربارەی خودی گرفتە یاساییەکان؟ ئەو نێرەی تەنیا بەهۆی کاغەزێکی دادگاوە بووەتە مێ - تەنانەت ئەگەر نەشتەرگەرییشی ئەنجام نەدابێت - دەتوانێت بڕواتە حەمام و سەرئاو و ژووری جلگۆڕینی ژنانەوە!

خوێنەری بەڕێز! خۆت وێنای ئەوە بکە، ئەگەر هەندێ گورگە مرۆڤی نێر ئەو ڕێپێدانە یاساییەیان دەستبکەوێت و نەشتەرگەری

و چارەســەری هۆرمۆنییــان وەرنەگرتبێــت، چــاوەڕێ دەکەیــت چ کارگەلێک ئەنجام بدەن؟!

کاردانەوەی بزووتنەوە سێکسییە ئازادەکان دەربارەی ئەو تـرس و تێبینییانە چی بوو؟ دەرکردن و دوورخستنەوە، با باســەکە بـۆ ژنە چالاکوان جۆلیا بیــک لێبگەڕێـین، کە دەڵێـت: "لە لیـژنەی LGBT دوورخـرامەوە، بەوپێـیەی، کە تـاکە هاوڕەگەزبـاز بـووم ڕاسـتییە زانستییەکانم بەڕاشکاوی بـاس کـرد، بە تونـدوتیژی تۆمەتباریـان کـردم! تـاوانەکەم چیـیە؟ بەکارهێنـانی جێنـاوی نێـرینە لە وەسـفی نێرێکــی دەســتدرێژکار، کە خـۆی وەک مــێ لەقەڵەمـداوە و پێــی خۆشە بەجێناوی مێینە بانگ بکرێت!!"[۱]

- گرفتــی بەکارهێنــانی جێناوەکــان بە ئــارەزووی کەسی بەرانــبەر، هۆکــاری وازهێنــانی زانــای دەروونـنــاس، پرۆفیســۆر (جـۆردان پێتێرسـۆن Jordan Peterson) بـوو لە وانەوتـنەوە لە زانکۆ لە ساڵی ۲۰۱۸دا.

لە دیمانەیەکی تەلەفزیۆنیدا لەگەڵ کەناڵی (BBC)ی هەواڵیـدا، پێشکەشــکارەکە لە پرۆفیســۆر جـۆردان دەپرسـێت: ئایـا پێتــوایە ئافرەتی ڕەگەزگۆڕاو ئافرەتێکی ڕاستەقینەیە؟

- پرۆفیسۆر جۆردان: پێموانییە.

- پێشکەشکارەکە: بۆچی؟

---

(1) Lesbian SeministExplains How The Wquality Act promotes Inequality: https:/shorturl.at/ajk14

- پرۆفیسۆر: چونکە ئافرەت بە شێوەیەکی سروشتی دەتوانێت سکپڕ ببێت و منداڵی ببێت، ئەندامی زاوزێی مێیینەی هەیە، شریتی بۆماوەییەکەی (کرۆمۆسۆمی XX)ـە، لە دیدی مندا جیاوازییە بایۆلۆجییەکان گرنگ و یەکلاکەرەوەن.[١]

کەواتە، لەوەی ڕابرد و لەو ترس و تۆقاندنەی بەرانبەر بە هزر و ڕادەربڕین و بیروباوەڕ ئەنجام دەدرێت لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا، یان ڕاستەوخۆ دەسڕێتەوە، وەک ئەوەی بەرانبەر بە کەناڵی (رواسخ) کرا لە یوتیوب و هەڕەشە لە خاوەنی هەژمارەکە کرا، کە باند دەکرێت و هەژمارەکەی بۆ هەمیشە دادەخرێت؛ بەم جۆرە ڕوون دەبێتەوە، کە ناتوانرێت ئەو پرسانە لە ڕووی زانستییەوە تاوتوێ بکرێن و لە ڕووی عەقڵانییەوە ڕەخنەیان لێ بگیردرێت، چونکە هەر زوو چەکی تۆقاندنی ترانسفۆبیا (Transphobia) و تۆقاندنی هاوڕەگەزبازی (Homophobia)ی بە ڕوودا بەرزدەکرێتەوە. تەنانەت، ئەگەر یەکێک لە قوربانییەکانیشیان بێت!

ڕاپۆرتەکەی کەناڵی (SKY News)ی بەریتانیتان لە بیرە، کە

---

(1) Jordan Peterson – Do you think a transgender is a real woman? https://shorturl.at/ijty7
دەبینیت ڤیدیۆکە دوای ماوەیەک سڕاوەتەوە، چونکە کۆمپانیای یوتیوب هەموو ئەو ڤیدیۆیانە دەسڕێتەوە، کە دژایەتیی ئایدۆلۆجیای کۆمەڵگەی هاوڕەگەزبازان دەکەن – تەنانەت ئەگەر زانستی و پزیشکییش بن.

باسی لە کۆژانەکانی سەدان ڕەگەزگۆڕ دەکرد و گەڕانەوەیان بۆ ڕەگەزە ڕاستەقینەکەیان، کە لە سەرەتای تەوەرەکەدا باسمان کرد؛ ئامادەکاری ڕاپۆرتەکە (سالی لۆکوود Sally Lockwood) باس لەوە دەکات، کە: (تا ئێستا هیچ ئامارێک نییە ژمارەی ئەو کەسانە دیاری بکات لە کرداری ڕەگەزگۆڕین پەشیمان دەبنەوە). قسەیەکی لەم شێوەیە دەکرێت وەک لێکەوتەی تۆقاندنی ترانس لێک بدرێتەوە، بەڵام کەسێکی وەک ڕۆبی وای دادەنێت، کە پرسەکە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاترە.

## قسەی زیاتر:

خـــوێنەری ئـــازیز! ئایـــا سەرســـام دەبیـــت، ئەگەر بزانیـــت کورتکراوەی بەناوبانگی (LGBT) بەردەوام و بە شـێوە و ئاراسـتە و خواستی جیاواز ڕووی لە زیادبوونە، کە دەکرێـت وەسـفی لادان نەتوانێت بەتەواوەتی وەسفی بکات؟ ئایا بەم نزیکانە هەوڵگەلێک دەبینـــین بـــۆ چەســـپاندنی خواســـتە سێکســـییە لادەرەکـــانی وەک سـێکس لەگەڵ نزیکـــان و ئـــاژەڵان، کە لە زۆرێـــک لە ویـــلایەتە یەکگرتووەکان و چەند وڵاتێکی تـری وەک ئەڵمانیـا و هەنگاریـا و مەکسیکیشـــــدا هەیە، یـــــان تەنـــــانەت سێکســـــکردن لەگەڵ تەرمەکانیشدا!؟!

لەوانەیە هەنـدێ لە دیـمەنەکەدا هەسـت بە نەبـوونی تەواوەتی خودا بکەن، بەڵام ئەگەر لە گۆشەیەکی ترەوە لێی بڕوانین، دەبینین خودا بەتەواوەتی لە دیمەنەکەدا دەردەکەوێت.

ئەوەی، تا ئێستا باسمان کردووە لە شێوەی نامەیەکی یاخییانەی شـــەیتانییە بەرانـــبەر بە پەروەردگـــار، بەکـــورتی واتە: ئـــێمە پێچەوانەی ڕێساکانت ڕەفتار دەکەین!

نە دەنگی عەقڵ گرنگە، نە دەرئەنجامەکانی زانست و

ئامۆژگاریی پزیشکان، ئامارەکانی نەخۆشییە دەروونییەکان و تاوانە یاساییەکان و ڕێژەی خۆکوشتن بەلامانەوە گرنگ نین، ئەوەی گرنگە بەدیهاتنی خواست و ئارەزووە لادەرەکانمانە، وەک ئەوەی ئایەتی پەروەردگاریان خوێندبێتەوە، کە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ۝٦ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ۝٧ ﴾ (المؤمنون: ٥ – ٧)

واتە: "کە عەورەتی بەر و دوای خۆیشیان دەپارێزن. تەنیا بۆ هاوسەری شەرعیی خۆیان، یان کەنیزەکیان نەبێت، کە بەگوێرەی شەرع بووبن بە هی ئەوان، بەڕاستی ئەوانە لۆمەیان ناکرێن، ئەگەر بچنە لای ئەو جۆرە کەسانە. دەی کەسانێ بەدوای لەو دوو ڕێگا شەرعییەی پەیوەندیی نێوان پیاو و ئافرەت بەولاوە بکەون، ئەوانە ئێجگار دەستدرێژییان کردووە. پاشان بڵێن: بەڵێ، ئێمە لادەرەکانین!"

پەنا بە پەروەردگار دەگرین لە خۆبەزلزانی و سنوورشکێنی، داواکارین لێی لەو خراپەکارییە بمانپارێزێت.

# هاوڕەگەزبازی و شەریعەتی ئیسلامی، ڕووەکەی تری دراوەکە!

پەروەردگـــار دەفەرموێـــت: ﴿... جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ... ﴿٨٢﴾﴾ (هود: ٨٢)

واتە: "شوێنەکەمان سەرەوژێرکرد و کاولمان کرد بەسەر یەکدا و بەردبارانمان کردن بە بەردێك لە جۆری قـوڕی بەبەردبـوو، کە بە شێوەیەکی تایبەت یەک لە دوای یەک ڕیزکرابوون".

لە فەرمـوودەیەکی بەپێـزدا هـاتووە، کە پێغەمـبەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لعن الله مَن عمل عمل قوم لوطٍ).[١]

واتە: "خـودا نەفـرەتی لەو کەسـانە کـردووە، کە کـرداری گەلی (نێربازیی) لوط ئەنجام دەدەن".

هەروەها لە فەرموودەیەکی تـردا دەفەرموێـت: (فـاقتلوا الفاعـل والمفعول به).[٢]

---

[١] رواه أحمد عن ابن عباس، (٢٩١٥) مسند الإمام أحمد، تحقيـق: شـعيب الأرنـاؤوط، مؤسسة الرسالة.

[٢] أخرجه أبو داود (٤٤٦٢)، والترمذي (١٤٥٦)، وابن ماجه (٢٥٦١)، وأحمد (٢٧٣٢).

واتە: "هەردوو لایەنی کردارەکەی نێربازی بکوژن".

ئەو دەقە پیـــرۆزانە پـــوختەی بۆچـــوونی خەڵـــکە دەربـــارەی پەیوەنـــدیی ئیســـلام بە پرســـی هاوڕەگەزبـــازییەوە! ئایـــا بەڕاســـتی پەیوەنـــدیی ئیســـلام بە هاوڕەگەزبـــازییەوە تەنیـــا ســـزادانە؟! یـــان پرسەکە ڕوویەکی تریشی هەیە؟!

## جیاوازیی پلەکان:

ئەگەر هاوڕەگەزبازی چەمکێک بێت، کە چەندین پلە و جۆر لە ژێر ناوەکەیدا کۆبوونەتەوە، ئەوا بێگومان پلەی یەکەم بـریتییە لە بیـرۆکە و خواســتە خۆنەویســتەکان، پاشــان پەل دەکێشــن بــۆ ئەنجامــدانی کردەیــی، کە لە ســەرەتادا زۆر ڕێگــری لە بەردەمــدا دەبێت و هەوڵدانێکی زۆری دەوێت؛ بەڵام دواتـر کەسـەکە ڕادێـت بەو کردارە قێزەونە، کە یەکـێکە لە گەورەتـرین تاوانەکـان. ئەوەی جێــی سەرســووڕمانە ئەوەیە، کە هەنـدێ کەس بە ئاشــکرا باســی دەکەن، تەنــانەت کــار گەیشــتووەتە ئەوەی، کە هەنـدێ کەس لە بــازنەی ئــایین ببــاتە دەرەوە، بەوەی بە حەرام و قەدەغە و شــیاو بە سزای نازانن!

یەکێک لە شوێنەوارەکانی بەزەیی خودایی – کە شارەزاترینە بە دەروونی بــوونەوەرانی – ئەوەیە لێپێچیــنەوە و ســزا لەســەر ئەو کــارانەیە، کە خواســت و بــژاردەی ئــازادانەی تێــدایە؛ هەروەهــا شەریعەت هێڵێکی جیاکەرەوەی لە نێوان خواستەکانی دەروون و وەسوەسە و کردار و چالاکییە ئازادانەکانی مرۆڤدا داناوە.

پێغەمـبەری خـوا (ﷺ) فەرمـوویەتی: (إن اللـهَ تَجَـاوَزَ لي عـن

أُمَّتي ما وسْوَسَتْ به صُدُورُهَا، ما لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَكَلَّمْ).[1]

واتە: "خودا لە وەسوەسەی دڵ خۆشبووە لە ئوممەتەکەمدا، تا ئەو کاتەی نەیکردووە بە کردار، یان گوفتار".

خواست و خوتخوتەکانی دەروون زۆر شتیان تێکەڵە، کە لە دەرەوەی دەسەڵاتی مرۆڤدان، وەک ژینگەی خراپ و پەروەردەی شێواو، یان شۆکێکی دەروونی، یان دەستدرێژییەکی سەردەمی منداڵی، کە کاریگەریی بەسەر هۆشەوە جێهێشتووە؛ هەروەها وەسوەسەی شەیتانەکانی و جنۆکە و فێڵ و تەڵەکەکانی شەو و ڕۆژ!

هەموو ئەمانە دەتوانن خواستی سۆزداری و سێکسی لە دەرەوەی فیترەتی دروست و سروشتیی مرۆڤایەتی دا دابڕێژن، بەجۆرێک خۆیشی نازانێت چۆن توانیویانە دەروازەی دڵ و دەروونی ببڕن!

ئەمانە وشەگەلێکن لە فەرهەنگی تاقیکردنەوەی ژیانی تایبەتی هەر مرۆڤێک، کە لە گۆڕەپانی دنیادا جوامێرانە دەجەنگێت، بەرەنگاریی دەروون و کەموکوڕییەکانی و ئازار و کۆژانەکانی و شێواوی و فیتنەکان دەبێتەوە، تا دەگات بە کەناری ئارامی.

---

[1] صحيح البخاري (٢٥٢٨).

بەڵام تەنـانەت، ئەگەر ئەو خواسـت و وەسوەسـانە گـۆڕان بـۆ کرداریش، واتای ئەوە نییە، کە ئیتر دەرگای گەڕانەوە داخراوە، ئەو دەرگایە، تا دەرچوونی کۆتا هەناسە داناخرێت.

## نێر وەک مێ نییە:

یەکێـک لە هۆکـارە ناڕاسـتەوخۆکان، کە دەبـنە هـۆی درووسـتبوونی مەیـلە هاوڕەگەزییەکـان، بـریتییە لە: نـاڕوونی ناسـنامەی ڕەگەزی و نەمـانی سـنووری نێـوان نێـر و مـێ و لەدەستدانی هەستکردن بە تایبەتمەندییەکانی نێرینەیی و مێینەیی.

لەبەر ئەوەیە ئیسـلام سـنوورێکی ڕوونی لە نێـوان هەردوو ڕەگەزەکەدا دانـاوە، بە جـۆرێکی ئەوتـۆ، کە نێـر، یـان مـێ تایبەتمەنـدی و ڕەفتـاری تـایبەت بە خـۆی هەیە. کـوڕ هەر لە منداڵییەوە هەست دەکات سەر بە کۆمەڵی پیاوانە، لەگەڵ باوکیـدا دێـت بـۆ مـزگەوت و لەگەڵ پیاوانـدا تـێکەڵ دەبێـت و خـۆی بە یەکێـک لەوان دەزانێـت و لە ئیسلامیشـدا وەک پیـاو مـامەڵەی لەگەڵدا دەکرێـت. پێغەمـبەری خـوا (ﷺ) بـۆ پیرەکـان مـۆڵەتی لە گەنجان وەردەگرت، هەروەک لە فەرمـوودەی صـەحیحدا هـاتووە: (جامێـک ئاویـان بـۆ پێغەمـبەری خـوا هێنـا لێـی خـواردەوە، لە دەستەڕاستیدا لاوێک دانیشتبوو، کە لە هەموویان بچـووکتر بـوو،

لە لای چەپیشـــی گەورەکـــان دانیشـــتبوون، فەرمـــووی: گەنجـــۆ! مۆڵەتم دەدەیــت سـەرەتا بیـدەمە گەورەکـان؟ ئەویـش گـوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! نامەوێت فەزڵی تـۆ بـدەم بە کەس، بـۆیە پێـی دا، کە لێی بخواتەوە.. هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرکـات بە لای منداڵاندا تێدەپەڕی، سڵاوی لێدەکردن).[1]

لە بەرانبەردا کچ لە دایکی و کۆمەڵی ژنان نزیکترە و پەیوەستە بە واتاکانی پۆشـتەیی و ئـابڕوو و نەرمونیـانی و خۆڕازانـدنەوە و وەک ئافرەتێک مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

[1] أتى رسول الله صلى الله علية وسلم على غلـمان يلعبـون، فسـلم علـيهم. (رواه أبـو داود، وأحمد).

## هەمووتان بەرپرسیارن:

پەروەردەی هەڵە کاریگەریی گەورەی بەسەر درووستبوونی خواستە هاوڕەگەزییەکانەوە هەیە، وەک نەمانی باوک بە جەستە و بە ئامادەبوون، یان بە گیان و فرمان، یان وشکی و سۆزداری و توندی و تێنەگەیشتن؛ یان نازدانی زیاد لە پێویست و پەیوەستبوونی لەڕادەبەدەر، یان جیاکاری لە نێوان منداڵەکاندا بەتایبەتی لە ڕووی خۆشەویستی و سۆز و گرنگیدانەوە، چ لەنێوان نێرەکاندا، کە کوڕ هە ست بکات لە جیهانی پیاوان دووردەخرێتەوە؛ یان لە نێوان نێر و مێدا، کە کچ زیاتر پەیوەست بێت بە جیهانی نێرینەییەوە بۆ پڕکردنەوەی ئەو سۆزەی لێی بێبەش کراوە.

هەریەک لە دایباب بەرپرسن و خودا لێپێچینەوەیان لەگەڵدا دەکات لەسەر خێزانەکەیان، لەسەر دادپەروەری و چاودێری و میهرەبانی و خۆشەویستی و ئارامی و بەجێگەیاندنی ئەرکەکەیان بەبێ جیاوازی و خەمساردی.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (ألا لا يجني والدٌ على ولده).[(١)]

---

(١) صحيح الترمذي ٣٠٨٧

واتە: "باوک تاوانەکانی منداڵ لەکۆڵ ناگرێت". ئەو منداڵانی ماچ دەکرد و خۆشەویستیی بۆ دەردەبڕین، ئەو ڕۆژە، کە منداڵ و ژنانی پشتیوانان (الأنصار) پێشوازییان لێ کرد، پێی فەرموون:

(والله إني لأحبُكم).[1]

واتە: "سوێند بە خوا، خۆشم دەوێن". هەروەها هەندێ لە ئەعرابەکان بینییان حەسەنی کچەزای ماچ دەکات، ئەعرابییەکان ڕەخنەیان لەو کارە گرت و وتیان ئێمە منداڵەکانمان ماچ ناکەین، ئەویش لە وەڵامدا پێی فەرموون: (من لا يَرحَم لا يُرحَم).[2]

واتە: "هەرکەس ڕەحم نەکات، خودایش ڕەحمی پێ ناکات".

ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) بەکورتی وەسفی دەکات، دەفەرموێت: "هیچ کەسم نەدیوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەبەزەییتر بێت بۆ منداڵان".[3]

هەر بۆیە شەریعەت قەدەغەی کردووە جیاکاری لە نێوان منداڵاندا بکرێت، تەنانەت لە بەخشش و دیارییشدا. پێغەمبەری

---

[1] مسند الإمام أحمد والموطأ

[2] أخرجه مسلم، كتاب الفضائل، باب رحمته صلى الله عليه وسلم الصبيان والعيال وتواضعه وفضل ذلك، (١٨٠٨/٤)، برقم: (٢٣١٧).

[3] أخرجه مسلم، برقم (٢٣١٦).

خوا (ﷺ) ڕەتی کردەوە شایەت بێت لەسەر دیاریی پیاوێک بۆ کوڕەکەی، تا دەیدات بە هەموو منداڵەکانی، ئەو کارەیشی بە ستەم وەسف کرد.[1]

شەریعەت قەدەغەی کردووە بە چاوی کەم سەیری کچ بکرێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کردووە لەگەڵ کچاندا باش بن. جارێکیان پیاوێک لە تەنیشتی دانیشتبوو، کوڕەکەی هات ماچی کرد و لە کۆشی خۆی داینا، پاشان کچەکەی هات دەستی گرت و لە تەنیشتی خۆی داینا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: (لە نێوانیاندا دادگەر نەبوویت). دادگەری ئەوەیە سەرنج و ماچ و دەستبەسەرداهێنان و زەردەخەنەکە بۆ هەردووکیان وەکو یەک بێت، بە هیچ جۆرێک نێر فەزڵی بەسەر مێدا نییە.

---

[1] ژنی بە شیر وتی: غوڵامەکەت بدە بە کوڕەکەم و پێغەمبەری خوایش (صلی الله علیه وسلم) بکە بە شاهێد. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (برای هەیە؟) وتی: بەڵێ. فەرمووی: (هەموویان وەک ئەویان دراوەتێ؟) وتی: نەخێر. فەرمووی: (وا نابێت، من تەنیا شاهێدی لەسەر حەق دەدەم).
بە شێوازێکی تریش هاتووە، کە فەرموویەتی: (کەواتە من مەکە بە شاهێد، من شاهێدی لەسەر ستەم نادەم). أخرجه مسلم (١٦٢٤).

## داخستنی دەرگاکان:

شـەریعەتی ئیسـلامی ڕێـگەی شـەیتان بـۆ گەیشـتن بە دڵـی بەندەکان دادەخات، بەربەست دەخـاتە بەردەم فیتنەکـان، هەر بـۆیە عەورەتەکان سنووردار دەکات و فەرمان بە داپۆشین و پاراسـتنیان و سەیرنەکردنیان دەکات، ئەگەر هەمان ڕەگەزیـش بێـت؛ تەنـانەت لە نێوان دایک و منداڵەکانیشدا. هەروەهـا پێغەمـبەری خـوا (ﷺ) فەرمـانی کـردووە جـێگەی خەوتنـی منـداڵەکان لە یەکـتر جیابکرێتەوە.[1]

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی کردووە پیاو لە تەنیشت پیاو ڕابکشێت، ئەگەر جلیان لەبەر نەبێت، یان تەنیا جلێکیان لەبەر بێت[2]؛ بە هەمان شێوە ژن لە تەنیشت ژن[1]، واتە:

---

(1) لە (عبدالله)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (عاص)ـەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مُرُوا أولادَكم بالصلاةِ وهم أبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ، واضْرِبُوهُمْ عليها، وهم أبْنَاءُ عَشْرٍ، وفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ في المَضَاجِعِ).
واتە: "لە تەمەنی حەوت ساڵیدا فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن نوێژ بکەن، لە دەساڵیدا لەسەر نوێژ لێیان بدەن و جێی خەوتنیان لەیەکتر جیابکەنەوە". (رواه أبو داود في كتاب الصلاة، باب مت ى يؤمر الغلام بالصلاة ١٣٣/١ (٤٩٥).

(2) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مُرُوا أولادَكم بالصلاةِ وهم أبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ، واضْرِبُوهُمْ عليها، وهم أبْنَاءُ عَشْرٍ، وفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ في المَضَاجِعِ).

واتە: "لە تەمەنی حەوت ساڵیدا فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن نوێژ بکەن، لە دەساڵیدا لەسەر

←

نابێت بە جلێکەوە بەتەنیا لەگەڵ یەکدابن، چونکە لەوانەیە کار بگاتە سەیرکردن و دەستدان لە لەشی یەکتر.

پێشینان و زانایان تەنانەت سەیرکردنی لاوی سەرنجڕاکێشیان بە ناپەسەند داناوە، هەموو ئەمانە وەک بەربەستێک و داخستنی دەرگا بەسەر فیتنە و خراپەکاریدا. ئەو ڕێکارانە دەبنە هۆی سنووردارکردنی دەستدرێژی و خراپەکاری، کە ئەگەر نەگیردرێنەبەر کۆمەڵگە بەرەو ژینگەیەکی خراپ و پڕ لە تاوان دەڕوات و مرۆڤ دەکەوێتە نێو زەلکاوی تاوان و خراپەکارییەوە.

---

نوێژ لێیان بدەن و جێی خەوتنیان لەیەکتر جیابکەنەوە. (رواه أبو داود (٤٩٥) وصححه الألباني في (صحيح أبي داود)).

[1] لە (جابر)ی کوڕی (عبدالله)وە هاتووە، کە فەرمـوویەتی: گ(وێـم لە پێغەمـبەری خوا (ﷺ) بوو، کە قەدەغەی دەکرد تەنیا بە یەک جل پیاو و پیاو یان ژن و ژن لە لای یەکتربن). (أخرجه أحمد (١٥١٨٤) واللفظ له، وابن أبي شيبة (١٧٨٨٨)).

## پاسەوانی دڵەکان:

گاڵتەکردن و ڕەفتاری خراپ و ڕەتکردنەوە، هەموویان هۆکارێکی کاریگەرن بۆ لادانە دەروونییەکان و خواستە هاوڕەگەزبازییەکان لە هەندێ بارودۆخدا، بەتایبەت ئەگەر ژینگە کۆمەڵایەتییەکە لەبار بێت بۆ گەشەسەندنی ئەو خواست و ئارەزوانە و پشتگیرییان بکات.

دامەزراوەی ڕەوشتیی ناسنامەی ئیسلامی بەرانبەر بەو پەتایانە لە جەنگدایە و بۆ ئەمەیش یاسا و بنچینەی تایبەتی داناوە، هەروەک پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ ... وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ ...⑪ ﴾ (الحجرات: ١١)

واتە: "مسوڵمان هەموو یەکن و ناو و ناتۆرەی ناشرین و خراپیش بەسەر یەکتردا هەڵمەدەن".

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ ولَا اللَّعَّانِ وَلَا الْفاحِشِ وَلَا الْبَذيءِ).[١]

واتە: "باوەڕدار تانەدەر و نەفرەتکەر و دەمپیس و زمانشڕ نییە".

[١] أخرجه الترمذي (٦٠٨١) قال: حديث حسن غريب.

هەروەها فەرموویەتی: (الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لَا يَظْلِمُهُ، وَلَا يَخْذُلُهُ، وَلَا يَحْقِرُهُ).[1]

واتە: "مسوڵمان برای مسوڵمانە، ستەمی لێ ناکات، بێئومێدی ناکات و بەسووك تەماشای ناکات".

مسوڵمان دەستی یارمەتی و باڵی ڕەحمەت بۆ برا مسوڵمانەکەی ڕادەخات، کە لەگەڵ دەروونی خۆیدا لە ململانێدایە. تەنانەت سزاکانیش لە ئیسلامدا بە ئامانجی تەمبێکردن و ترساندنن، هەر بۆیە مەرجگەلێکی وەهایان بۆ دانراوە، کە قورسە بەسەر کەسانێکی نوقمبوو لە تاوان و خراپەی ئاشکرایشدا جێبەجێ بکرێن. لە ئیسلامدا بە هیچ جۆرێک دەرگا بەسەر کەسی تەوبەکاری پەشیماندا داناخرێت.

پیاوێکی سەرخۆشیان هێنایە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرمانی کرد لێی بدرێت، خەڵک دەستیان کرد بە لێدانی، دواتر کە ڕۆیشت، پیاوێک وتی: خودا سەرشۆڕی کرد. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لا تَكُونُوا عَوْنَ الشَّيطان على أخِيكُمْ).[2]

واتە: "پشتی شەیتان مەگرن لە دژی براکەتان".

زۆر جار برینی زمان قووڵتر و بەئازارترە لە ئازاری شمشێر؛

---

[1] رَوَاهُ مُسْلِمٌ (٢٥٦٤)

[2] صحيح البخاري (٦٧٨١)

ژنێک زینای کرد، سکپڕ بوو، ڕەجم کرا، بەڵام تەوبەی کرد و پەشیمان بووەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر کرد. دوای ئەوە خەڵک باسیان کرد، بەرگریی لێ کرد و فەرمووی: (تەوبەیەکی وەهای کرد، ئەگەر بەسەر حەفتا کەسی خەڵکی مەدینەدا دابەش بکرێت بەشیان دەکات.[1]

تەنانەت یەکێک لە گەورەترین تاوانەکان، کە خاوەنەکەی لە بازنەی ئیسلام دەباتە دەرەوە، ئەوەیە براکەی بە ئەنجامدانی خراپەیەکی نەسەلمێنراو تۆمەتبار بکات، یان دوای ئەوەی تەوبەی کردووە بەچاویدا بداتەوە؛ لەو کاتەدا ئەو کەسە بۆی هەیە داوا بکات تۆمەتبەخشەکە سزا بدرێت و جەڵدی لێ بدرێت، چونکە شەریعەت کەرامەت و نامووسی پاراستووە.

[1] صحيح الجامع (٥١٢٨)

## ڕێگەی ڕزگاری و پەناگەی قایم:

شەریعەت بانگەوازی مرۆڤ دەکات، کە هۆکارەکان بۆ لابردنی بەڵا و نارەحەتییەکان بگرێتەبەر. یەکێک لەو هۆکارانەیش پرسکردنە بە پسپۆڕی دەروونناسی لە کاتی بڕیاردان و بنیاتنانی بەهرە خودییە سەرەکییەکاندا، کە یاریدەدەرن بۆ دەرهێنانی مرۆڤ لە لاوازی و هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ڕابردوو بۆ لێکۆڵینەوە لە سەرچاوەی لادانە سێکسییە هاوڕەگەزبازییەکان و هۆکارەکانیان، کە لە تەوەرەکانی پێشوودا باسمان کردن، پاشان تیمارکردنی برینەکانی دڵ و عەقڵ و دەروون و فیترەت، کە ئەو دڕکانە درووستیان کردوون؛ ئینجا تەواوکردنی کرداری گەشەکردنی ناسنامەی ڕەگەزی و چاکسازی تێدا کردن و بەهێزکردنی.

بەڵام ڕازاندنەوەی شەیتانە مرۆڤ و جنۆکەکان بۆ ڕێگەی ئاسان، گەورەترین بەربەستە لە بەردەم چاکبوونەوەدا. نیشاندانی خواست و کارە لادەرییەکان وەک شتێکی ئاسایی و ڕاست، کە پێویستی بە چارەسەر نییە، یان بە ناساندنیان وەک خواستی جینی، کە ناتوانرێت مرۆڤیان لێ ڕزگار بکرێت، یان لەسەر لێکەوتەکانی لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێت؛ یان هەر هەوڵێکی تری بەلاڕێدابردن

و شەرعاندن و حەڵاڵکردن! ئەمانە ئەو ژەهرانەن، کە بەدبەختی و چارەڕەشی و زیان بۆ مرۆڤ دەهێنن و خاوەنەکەیان دەخەنە نێو ئاگری مەترسییەکانەوە.

هەر مرۆڤێک لە ئازار ڕابکات و خودا لە دڵی دەربهێنێت، جگە لە ئازار هیچ شتێک نادووزێتەوە. ڕۆژێک دێت بۆی دەردەکەوێت، کە شەیتانە مرۆییەکان بە ماسکی هاوسۆزی ساختەوە، هەرگیز نابن بە فریشتەی ڕەحمەت بۆی. ئەوکات، ژیان واتایەکی نامێنێت! ئەوسا هەناسە دەبێتە دڕک و ڕۆیشتنی ڕۆژگار دەبێت بە سزا.

گەورەترین شت لە ئیسلامدا بوونی خودایە. ئەو خودایەی، کە شیاوی پشتپێبەستن و ڕووتێکردن و گومانی باش و داواکردنی سەرکەوتن و بەرچاوڕوونی و باوەڕپێبوونە، هەر ئەوە (سبحانە وتعالی) وازی لێ نەهێناویت، گوێ لە پاڕانەوەکانت دەگرێت؛ ئازار و ناخۆشییەکانت دەزانێت، خۆشی دەوێیت، لەسەر تێکۆشانت دژ بە دەروون و شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە پاداشتت دەداتەوە، تا ئەو کاتەی پەیوەستی پێیەوە؛ گومانی باشت پێی هەیە، لێی دەترسیت، پشت و پەناتە و جێتناهێڵێت.

خودا، کە گوێی لە ناڵەیە و هەوڵ و تەقەللا و ناخی مرۆڤ دەبینێت! خودا، کە هیچ کات دەرگە بە ڕووی کەسی گەڕاوەدا داناخات، بەڵکو پەنای دەدات و هێزی پێ دەبەخشێت!

مرۆڤ، هەرچەند خەڵک ڕەتی بکەنەوە، هەرچەند تۆمارەکانی

ڕابردووی بەچاودا بدەنەوە، هەرچەند لە پاشەملەوە باسی بکەن و لە باسیدا چاو لە یەکتر دابگرن؛ هێشتا خودا تەوبەکەی قەبووڵ دەکات، لە تاوانەکانی دەبووریێت، دەیخاتە ژێر باڵی ڕەحمەتی خۆیەوە، بەگەڕانەوەی خۆشحاڵترە لە گەڕانەوەی کەسێکی ونبوو بۆ لای کەسوکاری؛ دەرگای لەسەر پشتە و هیچ کات دایناخات، بەزەییەکەی هەموو شتێک لەخۆدەگرێت.

لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: (إِنَّ الْعِبَادَ يُعَيِّرُونَ وَلَا يُغَيِّرُونَ، وَاللَّهُ تَعَالَى يُغَيِّرُ وَلَا يُعَيِّرُ).

واتە: "بەندەکان دوای تەوبە و گۆڕان و گەڕانەوەیش هەڵەکانت لە یاد ناکەن و لە هەر دەرفەتێکدا بە چاوتدا دەدەنەوە، بەڵام پەروەردگار لە هەڵە و تاوانەکانت دەبووریێت، وەك ئەوەی هیچ هەڵە و تاوانێکت ئەنجام نەدابێت".

# ناوەڕۆک

ڕێخۆشکردن: تەقینەوە گەورەکەی سێکس لە سەدەی بیستەمدا ..................... ٧

شۆڕشی سێکسی: (مێژوویەکی کورت)................................. ٩

شۆڕشی گێرەشێوێنی ............................................ ١١

ئالوودەبوونی سێکس: ئارەزووی جیاواز و ویستی یاخییانە ........................١٧

هاوڕەگەزبازی: قەیران و ململانێ................................... ٢١

**سێکسی کۆم، چەند ڕاستییەک کە دەبێت بخرێنەڕوو ........................٢٦**

فەوزای فرمانەکان ................................................٢٩

کۆمەڵگەیەکی مەترسیدار ..........................................٣٢

سێکسی کوشندە.................................................٣٤

**هاوڕگەزبازی و جەنگ لە دژی سرووشتی مرۆڤایەتی........................٣٩**

پێناسە.........................................................٤٠

پاشخانێکی مێژوویی...............................................٤١

ژیارێک دژ بە مێژوو.. بەرزبوونەوەی کۆمەڵایەتی بۆ ئەنجامدانی هاوڕەگەزبازی .......٤٦

لۆبییەکانی هاوڕەگەزبازی، لە ڕقی زانست و حەقیقەت ........................٥٠

ڕەتکردنەوەی هەر هەوڵێک بۆ چارەسەر ........................................ ٥٢

توێژینەوەی ساختە و ناتەواو ........................................ ٥٤

کێشەکە لەکوێدایە؟ ........................................ ٦١

**جینەکان و هاوڕەگەزبازی.. جینەکانم ناچار بەم کارمیان کردم! ................ ٦٣**

ئایا ئێمە بەرپرسین لە بەرامبەر مەیلە سێکسییەکانماندا؟! ..................... ٦٣

جینەکان و ڕەفتاری مرۆڤ ........................................ ٦٥

جینەکان و هاوڕەگەزبازی ........................................ ٦٩

هاوڕەگەزبازی بەتەنیا نامێنێتەوە، پیدۆفیلیایش بەرێوەیە ..................... ٧٣

زانستی دەروونناسی و هاوڕەگەزبازی ........................................ ٧٦

ئاژەڵ و هاوڕەگەزبازی، لەنێوان کاری ئاژەڵ و ڕەفتاری مرۆڤدا ..................... ٨١

ژینگەی کۆمەڵایەتی ڕێگەیەکە بۆ هاوڕەگەزبازی ........................................ ٨٤

ئارەزوو، یان ڕزگاری ........................................ ٨٩

**هاوڕەگەزبازی و ئازادی لە ئازاردانی کەسانی تردا ........................................ ٩١**

زمانی ژمارەکان ........................................ ٩٢

کاریگەریی هاوڕەگەزبازی لەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگە، تاوان و خراپە و نەخۆشی:. ٩٦

منداڵی هاوڕەگەزبازان: ........................................ ١٠٠

پێباوکی: ........................................ ١٠٦

سەرئەنجام: ........................................................ ١٠٧

**چەسپاندنی هاوڕەگەزبازی.. لە سەکۆی سێدارەوە بەرەو بەڵگەنامەی هاوسەرگیری ..... ١١١**

بەر لە پەلکەزێڕینە........................................................ ١١٣

کۆمەڵگەی هاوڕەگەزبازان ........................................................ ١١٦

**کارەسات لە سێبەردا........................................................ ١٢٦**

**جیهانی نهێنیی خێزانە هاوڕەگەزبازەکان ........................................................ ١٢٦**

باوانی نەخۆش ........................................................ ١٢٨

هەڵوەشانەوەیەکی بێ چاکبوونەوە ........................................................ ١٣١

قوربانییەکانی ئەجێنداکە دیارن ........................................................ ١٣٣

جێندەر: قەیرانی مرۆڤی سەردەم........................................................ ١٣٦

جێندەر: مێژوو و بەڵگەکان ........................................................ ١٣٨

سیاسەتی زۆرەملێی جێندەر ........................................................ ١٤٠

مەترسیی جێندەر........................................................ ١٤٥

کۆمەڵگەیەک، کە گوێ بە مانەوە نادات........................................................ ١٤٩

**ڕەگەزگۆڕین و کوشتنی مرۆڤایەتی ........................................................ ١٥٠**

ناسەقامگیریی ناسنامەی ڕەگەزی........................................................ ١٥٢

باجدان........................................................ ١٥٤

دەپرسین: کێ ئەم خەرجییە لە ئەستۆ دەگرێت؟ ........ ١٥٥
پەشیمانییەکی زۆر درەنگ ........ ١٥٧
لە نێوان LGB و Tدا ........ ١٦١
قسەی زیاتر ........ ١٦٦
**هاوڕەگەزبازی و شەریعەتی ئیسلامی، ڕووەکەی تری دراوەکە! ........ ١٦٨**
جیاوازیی پلەکان ........ ١٧٠
نێر وەک مێ نییە ........ ١٧٢
هەمووتان بەرپرسیارن ........ ١٧٤
داخستنی دەرگاکان ........ ١٧٧
پاسەوانی دڵەکان ........ ١٧٩
ڕێگەی ڕزگاری و پەناگەی قایم ........ ١٨٢
**ناوەڕۆک ........ ١٨٥**

01

HOMOSEXUALITY
THE CRIME OF THE CENTURY

# هاوڕەگەزبازی

## تاوانی سەردەم

ئەم کتێبە دەربارەی پرسێکی هەنووکەیی و گرنگی ئەم سەردەمەیە. باس لە مێژوو و بنچینەی هاوڕەگەزبازی دەکات. هۆکارەکانی پەیدابوون و پەرەسەندنی دیاری دەکات؛ هەروەها باس لە ئایدۆلۆجیای جێندەر و گۆڕینی ڕەگەز و ئەو خراپە و تاوان و هەژانە دەروونییانە دەکات، کە لێیانەوە پەیدا دەبن.

بڵاوبوونەوەی هاوڕەگەزبازی نیشانەیەکە لە نیشانەکانی کۆمەڵگەیەکی نەخۆش، کە بەکاربردن و خۆشگوزەرانی تەنگیان پێهەڵچنیوە و لە پرسە گەورەکان غافڵیان کردووە و بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی تەندروستیان لە بیر بردووەتەوە. لە لێپرسینەوە لە واقیع و بیرۆکەکانی و کاریگەری بەسەر ئایندە و مانەوەیدا لایداوە؛ بەمەیش کۆمەڵگەیەک هاتووەتە کایەوە، کە گرفتە دەروونییەکان تیایدا بوونەتە کردەوەی ئازادانە و نیشانەکانی لاوازی کۆمەڵایەتی گۆڕاون بۆ ئازادیی تاکەکەسی.

لێرەدا بژاردەکە لەدەست خۆماندایە. ئاخۆ ئایندەمان لە واقیعێکی ناهەموار، کە زادەی کردەوەکانی خۆمانە، ڕزگار دەکەین. یان سەرسامیمان بە هەژموونی زۆرینە کاریگەریمان لەسەر دادەنێت و دوای چەند ساڵێک خۆمان لە دۆخێکدا دەبینینەوە، کە بە چەندین بیرۆکە و پەتا و هۆکار و ئامرازی کارەساتبار دەورەدراوین؟!

ئەم کتێبە بە شێوازێکی بابەتی و زانستی و ڕاشکاو و دوور لە سۆز و لایەنگیری نووسراوە. هەرچییەک خوێنەری بەڕێز لە دوتوێی ئەم کتێبەدا دەیخوێنێتەوە. قسەی زانستە و هیچ بۆچوونێکی کەسی و تایبەتیی تێکەڵ نەکراوە.

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ۳۰مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

/TafseerOffice

+964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

